

Shaqlawa Technical College

Nursing Department

# Medication Administration

ئەوە بزانە

ئەوەی ئەیزانی دڵۆپێکە

ئەوەی نایزانی دەریایەکە

بۆیە هەمیشە دوعابکە و بڵێ:

﴿ رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴾


Prepared By:

*Ahmad Muhammad*

*Nursing Department*

# Contents

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ



به پشتیوانی خوا گەورە توانیم دەست بکەم بە دروستکردنی ئەم کتێبە، الحمدلله توانیم تەواوی بکەم.

لەم کتێبەدا باسی شێوازەکانی پێدانی دەرمانم کردوە، وە چەند زانیاریەکم لەسەر دەرمان نووسیوە، وە هەوڵم داوە بە باشترین شێواز شتەکان بنوسم بۆ ئەوەی زیاتر لە شێوازەکانی دەرمان تێبگەن .

لە کۆتاییدا دەڵێم سوپاس بۆ خوای گەورە کە یارمەتی دام لە دروستکردنی ئەم کتێبەدا و وە سوپاسی مامۆستاکانم و گشت ئەو کەسانە دەکەم کە یارمەتیان داوم لە دروستکردنی ئەم کتێبە.

والصلاة وسلام على خير البشر

محمد صلى الله عليه وسلم

# Medication

دەرمان ماددەیەکە بەکاردێت بۆ چارەسەری نەخۆشی و خۆپاراستن لە نەخۆشی.

پێکهاتوو لە ماددەیەکی کیمیایی یان سروشتی ، کاریگەری لەسەر ئەو زیندەوەرانە دروست دەکات کە دەچنە لاشی مرۆڤەوە.

کاتێک دەرمانێک دەخورێت دوو جۆر کاریگەری هەیە:

1. Pharmacokinetics: کاریگەری لەش لەسەر دەرمان (لەش چی بەسەر دەرماندا دێنێت کاتێک دەخورێت).

کاریگەریەکانی لەش لەسەر دەرمان چوار قۆناغە:

1) Absorption
2) Distribution
3) Metabolism
4) Excretion

2. Pharmacodynamics: کاریگەری دەرمان لەسەر لەش (دەرمان چی بەسەر لەشدا دێنێت کاتێک کە دەخورێت).

# Some things about medication that you should know

1. *Names Of Th Medication*
    1) Generic Name ناوی زانستی
    2) Trade Name ناوی بازرگانی
    3) Chemical Name ناوی کیمیایی

پێویستە ناوی زانستی و ناوی بازرگانی دەرمان بزانین ، بەتایبەت ناوی زانستی. چونکە ناوی زانستی دەرمان ناوێکی نەگۆڕە و پێویستە هەموو کۆمپانیایەکی دەرمان ناوی زانستی دەرمانەکە بنووسێت، بەڵام ناوی بازرگانی ناوێکی گۆڕاوە واتا هەر کۆمپانیایەک بۆخۆی ناوێکی بازرگانی لێدەنێت.




2. Unit *Of Medication*
    1) 1g = 1000 mg
    2) 1CC = 1ml
    3) 1L = 1000 CC or ml
    4) 1CC = 100 Iu (International unit)

Note for Iu: Small Amount, Large Effect

Iu یەکەیەکە بەکاردێت بۆ ئەو دەرمانانەی کە بە بڕێکی کەم ، کاریگەریەکی گەورە دروست دەکات. بۆ نمونە:

دەرزی ئەنسۆلین کە لە نەخۆشی دەدەی ، بە Iu دەپێورێت . نابێت زیاتر لە (0.5ml) 50Iu بدەی بە نەخۆش . چونکە ڕێژەیەکی کەم لە ئەنسۆلین ،کاریگەریەکی گەورە دروست دەکات . بۆیە ئەگەر لە (0.5ml) 50Iu زیاتر بدەی بە نەخۆشەکە ئەوا نەخۆشەکە توشی کەمی شەکر لە خوێن دەبێتەوە کە پێیدەڵێن (Hypoglycemia) ، لەم بارەدا ئەگەر بە شێوەیەکی خێرا بەهانای نەخۆشەکەوە نەچیت لەوانەیە نەخۆشەکە لەدەست بدەیت.

3. *An important note: No medication may be given to a patient without a medication order from a licensed practitioner.*

تێبینیەکی گرینگ: بەهیچ شێوەیەک نابێت هیچ دەرمانێک بدرێت بە نەخۆش کە لە فایلی نەخۆشەکەدا نەبێت وە مۆڵەتی پزیشکی لەسەر نەبێت (بەبێ مۆڵەتی ئەو پزیشکەی کە پلەی لەتۆ بەرزتربێت).

## 4. Medication uses

Medication is used for three main purposes:

1) Prophylactic

بەکاردێ بۆ پێشگرتنی نەخۆشی ، واتا پێش ئەوەی توشی نەخۆشیەکە ببێت دەرمانی پێدەدەین بۆ ئەوەی توشی نەخۆشیەکە نەبێت.

بۆ نموونە: (دەرزی کوتان - ڤاکسین).

2) Therapeutic

بۆ چارەسەری نەخۆشی بەکاردێت کاتێک کەسەکە توشی نەخۆشیەکە بوبێت.

3) Diagnostic

بۆ دەستنیشان کردنی نەخۆشی بەکاردێت.

بۆ نموونە: دەرمانمان هەیە لە شێوەی ڕەنگ، دەخرێتە لەشی نەخۆشەکە لەکاتی ئەنجامدانی تیشک (اشیعە) بۆ دەرخستنی بەشی ناوەوەی جەستە بەشێوەیەکی ڕون.

## 5. Drug Interactions

Don't mix any medication, except 2 situations: بەهیچ جۆرێک دەرمان تێکەڵ ناکرێت، تەنها لە 2 حاڵەتدا نەبێت. ئەوانیش :

1) Antagonist Effect کاریگەری پێچەوانە

حاڵەتێکی کیمیاییە کە یەک دەگرێت لەگەڵ وەرگرەکانی لەش و چالاکی کەم دەکات.

بۆ نموونە: هەرکاتێک دەرمانێکت بە هەڵە دابەنەخۆش، دواتر دەرمانێکی ترت پێدا بۆ ئەوەی ئەو هەڵەیە ڕاست بکەیتەوە.

یانیش ئەگەر کەسەکە شتێکی خوارد و پەستانی خوێنی پێ بەرز بوویەوە، ئەوە دەرمانێکی پێدەدەین بۆ ئەوەی پەستانی خوێنەکەی داببەزێت.

2) synergistic effect کاریگەری هاوتەریب

کاتێک دەرمانێک دەدەی بە نەخۆش و پاشان دەرمانێکی تری پێبدەی بۆ ئەوەی کاریگەرییەکەی زیاتربێت.

بۆ نموونە: ئەوکەسانەی توش نەخۆشی ئایدز بوینە ئەوە لە ڕۆژێکدا دەبێت چەند دەرمانێک بەیەکەوە بخوات بۆ ئەوەی کاریگەری ڤایرۆسەکە کەمتر ببێتەوە.

## 6. *Rights*

ئەم شەش ڕاستیە دەبێت وەکو ناوی خۆت بیزانی:

*Six Rights to Ensure Safety in Giving Medication {six Rights}:*

1) Right patient
2) Right drug
3) Right time
4) Right dosage
5) Right route
6) Right effect

## 7. *Medication Forms*

شێوەکانی دەرمان بەگشتی پۆلێن دەکرێن بۆ سێ کۆمەڵە:

1) شل Liquid
2) ڕەق Solid
3) نیمچە ڕەق Semisolid

Forms: Capsule, Tablet, Ointment .......

## 8. *Routes For Administering Drugs*

1) Oral route
2) Topical route
3) Parenteral route
4) Pulmonary route




چۆنیەتی تێگەیشتن لە ڕاچێتەی پزیشکی ... RX

1) ناوی دەرمان دەنووسێت.
2) ژمەی دەرمانەکە دەنوسرێت.
3) شێوەی دەرمانەکە دیاری دەکات Tab یان amp .... هتد.
4) بڕی پێویست دیاری دەکات کە چەند دانە وەربگرێت.
5) دیاری دەکات ڕۆژی چەند جار وە چ کاتێک ئەو دەرمانە بەکاربێت.

## هەندێ وشەی گرنگ لە بواری دەرمانزانیدا کە پێویستە بیانزانیت.

1. Indication (pharmacological use)

بەکارهێنانی دەرمان واتە ئەم دەرمانە بۆ کێ بەکاردێت وە بۆ چ حاڵەتێکی نەخۆشی بەکاردێت.

2. Side effect

واتە کاریگەری لاوەکی ئەم دەرمانە چیە یاخود چ زیانێکی هەیە، چونکە وەک ئاشکرایە هیچ دەرمانێک نییە بێ زەرەر و زیان بێت.

3. Contraindication

واتە ئەم دەرمانە بۆ کێ بەکار نایەت، بەواتای ئەوە دێت ناتوانین هەموو دەرمانێک بۆ هەموو کەسێک بەکاربهێنین بۆ نمونە ڤۆلتارین بۆ کەسێک بەکارنایەت کە زەختی خوێنی هەبێت یان بۆ کەسێک برینی گەدەی هەبێت.

4. Dose

بریتیە لەو برە دەرمانەی کە پێویستە بدرێتە نەخۆش بۆ نمونە بری ٣٠ملگم بۆ هەرکیلۆیەک لە پێدانی ڤیالی Amoxicillin.

5. Composition of drug

واتە ئەم دەرمانە لەچی پێکهاتووە.

6. Mechanism of action

واتە ئەم دەرمانە بە چ شێوازێک ئیش دەکات.

7. Drugs interaction

واتە ئەو دەرمانەی دەدرێتە نەخۆش لەگەڵ کام دەرمانی تر ئەگەری هەیە کارلێک بکات و کاریگەریەکی ئاڵۆز دروست بکات بۆ جەستە.

8. Onset of action

ئەو کاتەیە کە کەسێک دەرمانێک دەخوات تا ئەو کاتەی کە کاریگەرییەکەی دەردەکەوێ.

bioavailability .9

بریتییە لە ڕێژەی دەرمانی بەردەست لە سوڕی خوێن.

Pregnancy and lactation .10

ئەمە بەواتای ئەوە دێت ئایا ئەم دەرمانە بۆ ئافرەتی دووگیان و دایکی شیردەر دەگونجێت.

کە دەرمانەکان دابەش دەکرێن بەسەر چەند کەتیگۆری (جۆر) ێکدا:

- category A:

لەو حاڵەتەدا سەلمێنراوە کە دەرمانەکە هیچ زیانێکی نییە.

- category B:

لەسەر ئاژەڵ تاقیکراوەتەوە زیانی نەبووە لەسەر کۆرپەلە بەڵام لەسەر مرۆڤ تاقینەکراوەتەوە,

بۆیە پێویستە بە وریاییەوە بەکاربهێنرێت.

- category C:

لەسەر ئاژەڵ تاقیکراوەتەوە زیانی هەبووە لەسەر کۆرپەلە بەڵام لەسەر مرۆڤ تاقینەکراوەتەوە,

بۆیە ئەم دەرمانانە کاتێک بەکاردێن کە پێویست بێت و هیچ جێگرەوەیەک نەبێت هەروەها سوودەکەی زیاتر بێت لە مەترسییەکەی.

- category D:

ئەم جۆرەیان مەترسی هەیە لەسەر لەناوچوونی کۆرپەلە تەنها لە حاڵەتێکدا بەکاردێن کە ژیانی دایکەکە بپارێزن.

- category X:

بەکارنایەت لەکاتی دووگیانی.

# کاتەکانی پێدانی دەرمان

کاتێک کە کەسێک نەخۆشە و لە نەخۆشخانە هەندێک  دەرمانی بۆ نوسراوە ، لەسەر دەرمانەکان چەند خەتێکی لێدراوە.

ئەم خەتانە مانای چییە؟




1×3

لە ڕۆژێکدا 3 جار




1×2

لە ڕۆژێکدا 2 جار




1×1

لە ڕۆژێکدا 1 جار




لەو کاتەی پێویستت پێبوو ، ئەوجا بەکاریدەهێنی.

وە بەزۆری لەجیاتی ئەوەی بنووسیّ

on Need ،ئەنوسرێت {عند الحاجة}




1×6

لە ڕۆژێکدا 6 جار




1×4

لە ڕۆژێکدا 4 جار

بۆ زیاتر تێگەیشتن سەیری ئەم خشتەیەی خوارەوە بکە.

ئەم خشتەیە زۆر زۆر گرینگە، وە پێویستە زانیاریت لەسەر ئەو جۆرە خشتەیە هەبێت.

ئەم خشتەیە پێیدەڵێن Medication Timetable {M Schedule, M Chart, M Record}

## *Parts of the Medication Order*

### The medication order consists of six parts:

1) Patient's name
2) Date and time the order is written
3) Name of drug to be administered
4) Dosage of the drug
5) Route by which the drug is to be administered
6) Frequency of administration of the drug

| **Name:** | | **Age:** | | **Gender:** | | | **Date: / /** | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **Diagnosis:** | | **ID:** | | **ABO:** | | | **Date of Admission: / /** | | | | | | | | |
| **Medication Name** | Dosage | Route | Frequency | 12 Am | 2 Am | 4 Am | 6 Am | 8 Am | 10 Am | 12 Pm | 2 Pm | 4 Pm | 6 Pm | 8 Pm | 10 Pm |
| **Hyfresh® eye drop** | 2 Drops | Eye Drop | 1×6 | ✓ | | ✓ | | ✓ | | ✓ | | ✓ | | ✓ | |
| **Viscotears® eye gel** | — | Eye Gel | O.N {on need} | | | | | | ✓ | | | | | | |
| **Ventolin® Nebulizer** | 2.5mg | Neb | 1×4 | ✓ | | | ✓ | | | ✓ | | | ✓ | | |
| **Ceftriaxone vial** | 1g | IV | 1×2 | | | | | | ✓ | | | | | | ✓ |
| **Paracetamol tab** | 500mg | Oral | 1×3 | ✓ | | | | ✓ | | | | ✓ | | | |
| **Aspirin® Tab** | 100mg | Oral | 1×1 | | | | | | | ✓ | | | | | |

# چەند تێبینییەک

1. لەکاتی دەرمان پێداندا شەش ڕاستیەکە لەیاد مەکە.

شەش ڕاستی بۆ دڵنیابوون لە سەلامەتی لە کاتی پێدانی دەرمان:

1) نەخۆشی ڕاست / بزانە ئەو نەخۆشەی کە دەتەوێ دەرمانی پێبدەی نەخۆشە ڕاستەکەیە.
2) دەرمانی ڕاست / دەڵنیابەوە کە دەرمانە ڕاستەکە دەدەی بە نەخۆش. ئەو دەرمانەی کە بۆی نوسراوە.
3) کاتی ڕاست / دەبێت ئەو دەرمانەی کە بۆی نوسراوە لەکاتی دیاریکراودا پێیبدەی.
4) ژەمی ڕاست / دڵنیابەوە لەو برەدەرمانەی کەبۆی نوسراوە.
5) ڕێگای ڕاست / ئەو دەرمانە بەکام ڕێگا دەدرێت بە نەخۆشەکە. لەڕێگای دەرزی، دەم....هتد.
6) کاریگەری ڕاست / دڵنیابەوە لەوەی کە دەرمانەکە کاریگەری خوازراوی دەبێت.

2. On Need/ لەم چارەسەرە هیچ کاتێکی بۆ دیاری ناکرێت ، لەو کاتەدا دەیدەی بە نەخۆشەکە کە پێویستی پێبێت.
وە لەسەر M Record ەکە کاتەکەی دیاریدەکەی کە چ کاتێک پێمان داوە.

3. 2×1/بۆ ئەم چارەسەرە بەجۆرێک کاتەکە دابنێ کە بۆ نەخۆشەکە کاتێکی گونجاو بێت.
وە کاتێک دەرمانت بە نەخۆشەکەدا پێویستە لە کاتی بەرامبەر پێیبدەی . بۆنموونە سەعات 10ی نیوەڕۆ دەرمانەکەت پێداوە ، ئەوا دەبێت سەعات 10ی شەو دووبارە دەرمانەکەی پێیبدەی.

4. هەرکاتێک خشتەی دەرمانت دانا، ڕەچاوی دوو شت بکە:

1) ژیان و گوزەرانی نەخۆشەکە بۆنموونە چ کاتێک دەخەوێت.
2) ڕەچاوی دەرمانەکە بکە. بۆنموونە دەرمانەکە دەبێت بەشەو بدرێت بە نەخۆش ، ناکرێ تۆ بچی بەڕۆژ بیدەیێ.

5. پێویستە لەکاتی دەرزی لێداندا وریای ئەم خاڵانەی خوارەوە بیت:

1) وریابیت دەرزیەکە لەڕێی IV دەدرێت یاخود IM.
   - گەر دەرزیەکە نوسراوبوو Only IV ئەوە نابێت لە IM بدەیت، بەڵکوو دەبێت بە IV لێیبدەیت.
   - گەر دەرزیەکە نوسرابوو IV or IM ئەوە ئازادیت بەکام شێواز لێیدەدەیت.
   - گەر نوسرابوو Only IM ئەوە بەس لەڕێی دەرزی ماسولکەوە IM لێیئەدەین.
2) دەبێت سەیری بەرواری بەسەر چونەکەی بکەیت.

6. کاتێک دکتۆر وتی پێش نان خواردن، واتا دەبێ دەرمانەکە دەبێت 20 بۆ 30 خولەک پێش نان خواردن بخورێت.
7. کاتێ دکتۆر وتی دوای نان خواردن، واتا دەبێت دەرمانەکە 10 بۆ 20 خولەک دوای نان خواردن بخورێت.



## شێوەکانی دەرمان

| | |
|---|---|
| 1. دەرزی تۆز | Vial |
| 2. دەرزی گیراوە | Ampule |
| 3. حەب | Tablet |
| 4. کەپسول | Capsule |
| 5. تەحامیل | Suppositories |
| 6. پاودەر | Powder |
| 7. جێڵ | Gel |
| 8. لەزگە | Patch |
| 9. مەرحەم | Ointment |
| 10. کرێم | Cream |
| 11. قەترە | Drop |
| 12. سپرای | Spray |
| 13. شروب | Syrup |
| 14. شامپۆ | Shampoo |
| 15. هەڵمژین | Inhaler |
| 16. دەرزی | Injection |

## *Factors influencing drug action:*

*ئەو هۆکارانەی کاریگەری دەکەنە سەرکاری دەرمانەکە:*

1) ***Age*** تەمەن
2) ***Body weight*** کێشی لەش
3) ***Physical condition*** باری جەستەیی
4) ***Route*** دەرمانەکە بە چ ڕێگایەک دەدەی بە نەخۆش
5) ***Time*** کات
6) ***Addiction*** ئاڵودەبوون
7) ***Metabolism & Excretion***

### دوای هەڵپچڕینی دەرمان دەبێت چەنێک بەکاربهێنرێت:

1) *شروبی گیراوە 20 بۆ 30 رۆژ*
2) *شروبی تۆز 5 بۆ 10 رۆژ*
3) *قەترەی گوێ 14 بۆ 21 رۆژ*
4) *قەترەی لوت 45 بۆ 90 رۆژ*
5) *قەترەی چاو 20 بۆ 30 رۆژ*
6) *کرێم ومەلهەم 2 بۆ 3 مانگ*
7) *دەرزی واباشترە نەگاتە 12 کاتژمێر*

*دوای ئە م ماوانە لە هەڵپچڕینی دەرمان بەسەردەچن*

Common Abbreviation: کورتکراوە باوەکان

H.S = Hora Sommi , At Bed Time

N.P.O = Nor Par Os , Nothing By Mouth

P.O = Par Os , By Mouth

BID = Bis In Die , Two Time Per Day

TID = Ter In Die , 3 Time per Day

QID = Quatre In Die , 4 Time Per Day

PRN = Pro Re Nata , On Need

# Differences between Cream and Ointment

## کرێم Cream



1. تێکەڵەیەکە نیوەی لە ئاو و نیوەکەی تری لە ڕۆن پێکهاتووە.
2. چڕی کەمترە و بە ئاسانی بڵاودەبێتەوە بە ناوچەیەکی فراواندا.
3. لەبەر ئەوەی ئاو زۆرە لە پێکهاتەیدا بەخێرایی لەلایەن پێستەوە هەڵدەمژرێت و وشک دەبێتەوە، باشتر وایە بۆ پێستی چەور بەکاربهێنرێت.
4. کرێم زیاتر لەسەر چینی دەرەوەی پێست ئیش دەکات.
5. کرێم زووتر بەئاو لادەچێت.

## مەرحەم Ointment

1. نزیکەی 80% لە ڕۆن پێکهاتووە.
2. چڕی زۆرە و بەئاسانی بڵاونابێتەوە بە ناوچەیەکی فراواندا.
3. درەنگ وشک دەبێتەوە، باشتر وایە بۆ پێستی وشک بەکاربهێنرێت چونکە چەورە واتا لەسەر پێست ئەمێنێتەوە، بە ئاسانی نامژرێت.
4. بەکاردێت بۆ پێست و ڕوکاری ناوەوەی لەش (ناو دەم، پێڵوی چاو .... هتد)
5. مەرحەم هەڵدەمژرێت بۆ چینەکانی تری ژێرەوەی پێست.
6. مەرحەم تاخیر بەئاو لادەچێت چونکە چەورترە.



# Differences between ampule and Vial



❖ All Ampules are Solution.

هەموو ئەمپولەک, گیراوەیە {Solution}.

وە ئەمپولیش هەیە powder ی تێدایە بەڵام زۆر بە دەگمەن.

نموونە: دەرمانی Hydralazine، ئەمپولە بەڵام powder ی تێدایە .



❖ All vials are powder.

هەموو ڤیالەک تۆزە {Powder} .

وە ڤایەڵیش هەیە گیراوەیە {Solution} ، بەڵام زۆر بە دەگمەن.

نموونە:

- Heparin
- Amikacin
- Keppra

ئەم دەرمانانە ڤایەڵن و گیراوەشن {solution}.

# چۆنیەتی ئامادەکردنی ئەمپول {Ampule}

Equipment:

1) Ampule 0f Medication
2) Gloves
3) Sterile Syringe
4) Gauze or Cotton
5) Medication Record

## 1) Breaking the Ampule



1. Wash your hands.

دەستەکانت بشۆ



2. Make sure all the liquid is in the bottle of the ampule.

دڵنیابە کە هەموو شلەکە لە خوار ملی ئەمپۆلەکەوەیە، لەو شوێنەی کە دەشکێت. ئەگەر هەندێک لە شلەکە لە سەرەوەی شوێنی شکانەکەبوو ، بە نەرمی لە سەرەوەی ئەمپۆلەکە بدە هەتا شلەکە بەرەو خوارەوە برِوات.



3. Use gauze or Cotton to protect your hands when you grip the ampule.

بە گۆوز یان پارچە لۆکەیەک سەری ئەمپولەکە بگرە بۆ ئەوەی شوشە نەچێتە دەستەوە کاتێ سەری ئەمپولەکە دەشکێنی .

نیوەی سەرەوەی ئەمپۆلەکە دەبێت لە دەستی زاڵی تۆدا بێت، وە نیوەی خوارەوە دەبێت لە دەستی نا زاڵ بێت .

ئەگەر خاڵێکی رەنگاورەنگ لەسەر نیوەی سەرەوەی ئەمپۆلەکە هەبێت، ئەمە خاڵی فشارە. پێویستە پەنجەی دەستی زاڵت راستەوخۆ لەسەر ئەم خاڵە دابنێیت.



4. Hold the bottom half of the ampule in place and snap the top half towards you.

خوارەوەی ئەمپولەکە بگرە و سەری ئەمپولەکە بۆخۆت راکێشە.



5. Throw the head of the Ampule.

سەری ئەمپولەکە فرێبدە.

## چەند تێبینییەک

- پێش ئەوەی ئەمپولەکە حازربکەی بزانە ماوەکەی بەسەرچووە یان نا.
- بزانە ئەو ئەمپولە بە چ رێگایەک دەدرێ { SC, IM, IV}
- ئەگەر سەری ئەمپولەکەت شکاند و لەگەڵ شکاندنەکە ، پارچە شوشەی لەگەڵ هات ئەوا پێویستە درمانەکە فرێبدەی چونکە لەوانەیە هەندێک پارچە شووشەکەتبێتە ناو ئەمپولەکە.
- ئەگەر ئەمپولەکە 10CC بێت ، دەبێت سرنجەکەش سرنجێکی 10CC بێت.

## 2) Withdrawing Solution from the Ampule



1) Insert the syringe needle into the ampule without touching the rim of an ampule and needle of syringe.

دەرزیەکە بخەرە ناو ئەمپولەکە بەبێ ئەوەی دەستت بەر لێواری سەری ئەمپولەکە و نیدڵی سرنجەکە بکەوێ.



2) Draw the solution in the Ampule.

گیراوەکە لەناو ئەمپولەکە سەحب بکە .

بۆ ئەوی تەواوی دەرمانەکە لەناو ئەمپولەکە نەمێنێتەوە ، هەوڵبدە بە هێواشی دەرمانەکە سحب بکەی .



3) Throw the ampule glass in the trash.

شوشەی ئەمپولەکە فرێ بدە ناو زبڵدانەوە .



4) Remove any air bubbles from the syringe.

هیچ بڵقە هەوایەک لە سرنجەکە مەهێڵە.

بە پەنجە چەند جارێک لە سرنجەکە بدە بۆ ئەوەی بڵقە هەواکان بچنە سەرەوە و پاشان پاڵ بە سەری سرنجەکەوەبنێ بۆ ئەوەی هەواکەی لێبێتە دەرەوە .




5) Dispose of the used syringe and needle in a sharp box.

سرنج و نیدڵەکە فرێدە ناو سندووقی تیژ { سندووقی تیژ ئەوە سندوقەیە ، کە ئەو شتانەی تیژن و دەست دەبرن وەکوو نیدڵ و شەفرە و کانولا فرێ دەدەینە ناوی بۆ ئەوەی زیان بەکەس نەگەیێنێت}

# چۆنیەتی ئامادەکردنی ڤایەڵ {Vial}

Equipment:

1) Vial of Medication
2) Gloves
3) Sterile Syringe
4) Gauze or Cotton
5) Medication Record

1. دەستەکانت بشۆ.
2. Gloves لەدەست بکە.
3. سەیری ڤایەڵەکە بکە بزانە بەسەرچووە یان نا ،وە بە کام رێگا دەدرێت بە نەخۆش .{SC, IM, IV}
4. ئەو ڤایەڵانەی کە ئاوی تەعقیمکراویان لەگەڵە ، ئەگەر ئاوە تەعقیمکراوەکە 10CCبێت ئەوە دەبێت سرنجەکەش سرنجێکی 10CC بێت.
5. لەدوای ئەوەی ئاوە تەعقیمکراوەکەت سەحبکرد هەوای ناوسرنجەکە بەتاڵ مەکەوە.
6. سەری ڤایەڵەکە بکەوە بەڵام دوای ئەوەی سەری ڤایەڵەکەت کردەوە بەهیچ شێوەیەک دەست لە ناوەڕاستی سەری ڤایەڵەکە نەدەی.
7. نیدڵەکە داخیلی ڤایەڵەکە بکە و ئاوەکەی تێبکە.
8. تێکەڵکردنی ئاوەکە لەگەڵ ڤایەڵەکە پێی دەگوترێ {Dilution or Reconstitution}.
9. دواتر ڤایەڵەکە لەناو دەستت بوخلێنەرەوە بەڵام بەهیچ شێوەیەک نەیشەقێنی چونکە واباسکراوە کە ئەو دەرمانە بەشێکی پێکهاتەکەی تێکدەچێت بە شەقاندنی زۆر.
10. دوای ئەوەی دەرمانەکە هەمووی تەخفیف {Dilution} بوو ، دەرمانەکە سەحب بکە.
11. لەکۆتاییدا بلَقە هەوایەکانی ناوسرنجەکە بەتاڵ بکەوە بەڵام نەکەی دەرمانەکە زۆر بڕژێ لەکاتی هەوا بەتاڵ کردنەوەکە چونکە دۆزەکەی تێکدەچێ .






# Routs For Administering Medication






# *Oral Route*

## *Oral route*

- Oral route
- Enteral route
- Sublingual administration
- Buccal administration

## *Administrate in:*

- Having patient swallow drug
- Administering drug through an enteral tube
- Placing drug under tongue
- Placing drug between cheek and gum

**Routes of Medication Administration**

*Oral Routes*



Oral medications are given by mouth and swallowed with fluid. They are absorbed by the stomach and the small intestine.

Sublingual medications are given under the tongue until the medication dissolves.



Nursecepts



The buccal route of mediation administration involves using the inside of the cheek.



# 1- *Oral route*



ئەم جۆرە ڕێگایە بەکاردێت بۆ قوتدانی دەرمان.
دەرمانەکان لە گەدە (Stomach) و ریخۆڵە باریکە (Small intestine) هەڵدەمژرێن.

پێدانی دەرمان لەڕێگای قوتدانەوە کاریگەرییەکەی هێواشترە بەبەراورد بە ڕێگاکانی تر.

ADVANTAGES

- It's the most common way
- Safe
- Easy to Swallow and Convenient
- Painless
- Self-administration
- No Need for Sterilization

DISADVANTAGES

- Slow effect, GIT irritation
- Food - drug interactions
- Drug-drug interactions
- First pass effect
- No complete absorption
- Effect too slow for emergencies
- Unpleasant taste of some drugs
- Unable to use in unconscious patient
- It is not suitable for patient have vomiting and diarrhea

شێوەی ئەو دەرمانانەی کە لە ڕێگای دەمەوە دەدرێت:

1) حەب Tablet
2) کەپسول Capsule
3) شروب ( تۆز و گیراوە ) syrup
4) پاودەر Powder
5) قەترە Drop

هەندێک لەکاتی خواردنی حەبدا ئاو بەکارناهێنن و واهەست دەکەن ئاویان پێویست نییە بۆئەوەی پاڵ بە حەبەکەوە بنێن بۆ گەدە.

بەڵام ئەم بیرکردنەوەیە هەڵەیە زیان وە زیان کەسەکە دەگەیێنێ.

زیانەکانی خواردنی حەب بەبێ ئاو

هۆکات بەکارهێنان و بایەخ نەدان بە خواردنەوەی ئاو لەگەڵ حەبدا دەتوانێت توشی هەوکردنی دیواری گەدەت بکات و ترشەڵۆک و دڵەکزێ دروست دەکات، ئەگەر ئەو کارە زۆر دووبارە بکەیتەوە ئەواڕێگەخۆشکەر دەبێت بۆ توشبوون بە قورحەی گەدە و هەوکردنی درێژخایەن.

سوودەکانی خواردنی حەب لەگەڵ ئاودا

بەپێی توێژینەوەزانستییەکان دوکەوتووە ئاو هۆکارێکی سەرەکیە بۆ کەمکردنەوەی زیانەکانی دەرمان لەسەر کۆئەندامی هەرس، هەروەها ڕۆڵی لەرمەی ڕۆیشتنی دەرمان دەداتە بەناو قورگ و سورێنچکدا و بەوشێوەیە دەگاتە گەدە، ئاو دەبێتە هۆی ڕونبوونەوەی ترشی ناو گەدە و خەستی حەب و ئەوەش وادەکات زیانی کەمتر بێت لەسەر دیواری کۆئەندامی هەرس.

## ئەگەر نەخۆشێکت هەبوو توشی ڕشانەوە بوو یانیش ڕەتیکردەوە کە دەرمانەکە بخوات لەم حاڵەتەدا پێویستە چیبکەین؟



1) ئەگەر نەخۆشەکە ڕەتیکردەوە کە دەرمانەکە بخوات ئەوا نابێت دەرمانەکەی پێبدەی بەڵکو لەم حاڵەتەدا دەبێت سەروی خۆت ئاگادار بکەیتەوە و پێی بڵێی کە دەرمانم داوە بە نەخۆشەکە بەڵام ڕەتیکردۆتەوە بیخوات.



2) ئەگەر نەخۆشەکە توشی ڕشانەو ببوو وە کاتێک حەبێکت پێدا و دووبارە ڕشایەوە ئەوا حەبێکی تری پێمەدە. لەم حاڵەتەدا دەبێت سەروی خۆت ئاگادار بکەیتەوە و پێی بڵێی کە دەرمانم داوە بە نەخۆشەکە بەڵام ڕشاوەتەوە.

## کە نەخۆشێک حەبێکی بۆ نوسرابێت، چۆن پێیبدەین؟

فایلی نەخۆشەکە بپشکنە.

کەلوپەلەکان ئامادە بکە، وەکو:

1) Gloves
2) Medication
3) Glass of water
4) PPE, in need
5) Medication in disposable cup or oral syringe
6) Tab Crasher

دەرمانەکە بخە ناو Cap ەکە ( سەری قتوی دەرمانەکە) پاشان بیدە دەست نەخۆشەکە و پێی بڵێ کە بیخوات، دواتر پەرداخە ئاوەکەی بدە دەست بۆ ئەوەی لەگەڵ دەرمانەکە بیخوات. لەکۆتاییدا تۆماری بکە لە Medication Record ەکە کە دەرمانەکەت داوە بە نەخۆشەکە.

ئەگەر نەخۆشەکە حەساسیەی بەو دەرمانە هەبوو، ئەوا دەرمانەکەی پێمەدە. بەڵام ئەگەر دوای ئەوەی دەرمانەکەت پێدا توشی حەساسیە بوو ئەوا سەروی خۆت ئاگادار بکەوە.



نیشانەکانی حەساسیە(Allergy) :

1) سووربوونەوە Redness
2) پەڵەی سوور
3) خوران Itchy
4) لیر Hives
5) هەناسەدانی خێرا Tachypnea

# 2- Enteral Route

ئەگەر کەسێک توانای قوتدانی دەرمان  یان ئیشتیهای نەبوو ئەوا لەڕێگای NG tube دەرمانەکەی پێدەدەین.

## NG tube چیە؟

Nasogastric tube سۆندەیەکی لاستیکیە بەکاردێت بۆ ئەو نەخۆشانەی کە توانای قوتدانیان نیە، سۆندەکەشلە لوتەوە بۆ نەخۆشەکە دادەنرێ بۆ ناو گەدە.




ئەم سۆندەیە بەکاردێت بۆ:

1) پێدانی خواردن
2) پێدانی دەرمان
3) کەسێک ئیشتیهای نەمابێت
4) کەسێک کە بێهۆشبێت
5) گیرانی سورێنچک
6) ئەو کەسانەی نەشتەرگەری نێودەمیان بۆکراوە
7) دەرهێنانی نمونەیەک لە ناوەرۆکەکانی گەدە بۆ شیکردنەوە
8) بۆ لابردنی خوێن لە گەدە

## What are the risks of nasogastric intubation?

If your NG tube isn't inserted properly, it can potentially injure the tissue inside your nose, sinuses, throat, esophagus, or stomach. This is why placement of the NG tube is checked and confirmed to be in the correct location before any other action is performed.

NG tube feeding can also potentially cause:

- abdominal cramping ژانە سک
- abdominal swelling ئاوسانی سک
- diarrhea سکچوون
- nausea ھێڵنجدان
- vomiting ڕشانەوە
- regurgitation of food or medicine ھەڵهێنانەوەی خواردن یان دەرمان

# 3- *Sublingual and Buccal administration*

Sublingual and buccal medication administration are two different ways of giving medication by mouth. Sublingual administration involves placing a drug under your tongue to dissolve and absorb into your blood through the tissue there. Buccal administration involves placing a drug between your gums and cheek, where it also dissolves and is absorbed into your blood

پێدانی دەرمان لەرێگای ژێر زمان و ژێر رومەت  دوو رێگای جیاوازن بۆ پێدانی دەرمان لەرێگای دەمەوە. رومەت و ژێر زمان ژمارەیەکی زۆر مولولەی خوێنیان تێدایە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی دەرمانەکان ڕاستەوخۆ بچنە ناو خوێنەوە بێئەوەی بە کۆئەندامی هەرسدا تێبپەڕێت.

**پێدانی دەرمان لەرێگای ژێر زمانەوە (Sublingual Administration):** لەم رێگایەدا دەرمانەکە دەخەینە ژێر زمانەوە بۆ ئەوەی بتوێتەوە و پاشان هەڵبمژرێت بۆ ناو خوێن لەلایان ئەو شانانەی کە لەژێر زمانەوەن.

**پێدانی دەرمان لەرێگای ژێر رومەت (Buccal Administration):** بریتییە لە دانانی دەرمانێک لەنێوان رومەت و پوکەوە. پاشان دەتوێتەوە و هەڵدەمژرێتە ناو خوێنەوە.




شێوەی ئەو دەرمانانەی کە لە رێگای ژێر زمان و ژێر رومەتەوە دەدرێت:

1) Tablet
2) Caplet
3) Spray
4) Films

## When sublingual and buccal drugs are given?

دکتۆرەکەت لەوانەیە دەرمانی ژێر زمان و ژێر رومەتت بۆ بنوسێت لەژێر یەکێک لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

- the drug needs to get into your system quickly
- you have trouble swallowing medication
- the medication doesn’t absorb very well in the stomach
- the effects of the drug would be decreased by digestion

## Advantages

- the medication absorbs quickly
- can be important during emergencies when you need the drug to work right away, such as during a heart attack.
- don’t need to swallow the drug. Drugs that are absorbed under the tongue or between the cheek and gum can be easier to take for people who have problems swallowing pills.
- these drugs do not go through the digestive system, so they aren’t metabolized through your liver. This means you may be able to take a lower dose and still get the same results.

## Disadvantages

sublingual and buccal drugs also have some disadvantages. Eating, drinking, or smoking, can affect how the drug is absorbed and how well it works.

# Topical Route

| Topical route | Applying drug onto skin or mucous membrane |
|---|---|
| Vaginal administration | Vagina |
| Rectal administration | Rectum |
| Inunction | Rubbing drug into skin |
| Instillation | Placing drug into direct contact with mucous membrane |
| Irrigation | Flushing mucous membrane with drug in solution |
| Skin application | Applying transdermal patch |



# 1- Vaginal administration




پێدانی دەرمان لەڕێگای ئەندامی زاوزێی مێینەوە.

لە مێیەدا دەرمانەکان لە ڕێگای vaginal opening ەوە دەدەین بە نەخۆشەکە.

تێبینی/ لە ئەندامی زاوزێی نێرینەدا urethra opening مان هەیە بەڵام Vaginal opening مان نیە.

سێ شێوەی دەرمانمان هەیە کە لە Vaginal دەدرێت:

1) Suppository
2) Tablet
3) Cream

## 1. Vaginal Suppositories

Vaginal suppositories are solid medications that are inserted into the vagina with a special applicator. The body absorbs drugs from vaginal suppositories quickly. They work faster than medications you take by mouth. This is because suppositories melt inside the body and absorb directly into the bloodstream.

چۆنیەتی بەکارهێنانی تەحامیل

ئافرەت دەتوانێ خۆی Suppository بۆخۆی دابنێ. بەڵام ئەگەر بێهۆشبوو یان نەیتوانی ئەوا دەبێت کەسێک بۆی دابنێت.

Procedure

1) Equipment (Suppository – applicator – Gauze – Medication Record)
2) Wash your hand and vaginal area, and dry well with a clean towel.
3) Remove any wrapping from the suppository.
4) Place the suppository onto the end of the applicator.
5) Hold the applicator by the end that does not contain the suppository.



6) Get into position. delivery position
7) Clean the vaginal with a Gauze.
8) Gently insert the applicator into the vagina as far as it will comfortably go.
9) Press the applicator’s plunger as far as it goes. This will push the suppository far back into your vagina.
10) Remove the applicator from your vagina.
11) Wash your hands.



## 2. Vaginal Cream

Equipments:

1) Medication with applicator, if appropriate
2) Water-soluble lubricant
3) Perineal pad
4) Washcloth, skin cleanser, and warm water
5) Gloves
6) Gauze
7) PPE, in Need
8) Administration Record (MAR)

**How to Apply Vaginal Cream**

1. Take the cap off the tube of medicine and attach the tube of medicine to the applicator.



2. Squeeze the medicine into the applicator slowly until the plunger reaches the prescribed dose measurement. Remove the applicator from the tube of medicine. Put the cap back on the tube.



3. Lie on your back with your knees bent. Hold the applicator in one hand.



4. Put the applicator into your vagina (like a tampon) as far as you can.



5. Slowly press the plunger until it stops. Remove the applicator. Rinse the applicator.



Ask your healthcare provider or pharmacist if you should wear gloves when you apply vaginal cream.



## 3. Vaginal tab Administration

**Important note**

- In cases of mens, don't administer medication through the vaginal route.
- In cases of unmarried female, don't administer medication through the vaginal route.

1) Vaginal خاوێن دەکەینەوە بە Gauze
2) تابەکە دەخەینە سەر Tab holder و پاشان سەری Tab holderەکە بە lidocaine دەکەین.
3) دواتر داخیلی Vaginal opening دەکەین و پاڵ بە سەری Tab holderەکە دەنێین بۆ ئەوەی تابەکە بچێتە ژورەوە.
4) دوای ئەوەی تابەکەمان خستە ژورەوە، Tab holderەکە دێنینە دەرەوە.
5) پاشان ڕیکۆردی دەکەین لەسەر Medication Record

# 2- *Rectal administration*

پێدانی دەرمان لە لێگای دەرچەی کۆم (Rectal Canal)



شێوەی ئەو دەرمانانەی کە لە دەرچەی کۆمەوە (Rectal Canal) دەدرێن:

1) تەحامیل

دەبێت تەحامیل (Suppositories) لەژێر 25 پلەی سیلیزیدا هەڵبگیرێت بۆ ئەوەی دەرمانەکە تۆزێک ڕەق بێت هەتاوکوو پێدانی ئاسانتربێت ( easy to insertion)

RECTAL SUPPOSITORY



Be sure to wash your hands before insertion.



Rectal suppository positions. You can stand with one foot up on a chair. You can also lie down on your side with your top leg slightly bent toward your stomach and with your bottom leg straight.



Insert the suppository into the rectum, narrow end first.




For adults, push the suppository in about 3 inches. For children, depending on their size, push it in a 1/2 inch to 2 inches. For infants, push it in about a 1/2 inch.

healthline

## Procedure

1. Cheek Medical Record
2. Equipment
   1) Suppository
   2) Lidocaine
   3) Gloves
   4) Gauze
3. Hand washing
4. Introduce
5. Verify
6. Explain The procedure to the Patient

7. داوا لە نەخۆشەکە بکە بکەوێتە سەر لای ڕاست یان چەپ lateral position (Right or left Position)
بەڵام ئەگەر نەخۆشەکە بێهۆشبوو ئەوا دەبێت خۆت بیخەیتە سەر لایەک
8. ئەگەر کەسەکە ئاگای لەخۆییێت داوای لێدەکەین لاقێك بنوشتێنێتەوە (flex بکات) پاشان هەناسەیەکی قوڵ هەڵمژێت .
بەڵام ئەگەر کەسەکە ئاگای لەخۆی نەبوو ئەوا خۆمان لاقێک flex دەکەین
9. سەیری Rectal بکە بزانە هیچ پیسیەکی پێوەیە (چونکە ئەگەر نەخۆشەکە لە باری بێهۆشیدابێ، ناتوانێ خۆی پاک بکاتەوە) بۆیە ئەگەر هەر پیسیەکی پێوەبوو بە Gouze کە خاوێنی بکەوە
10. پاشان هەندێک lidocaine دەخەینە سەرپشتەدەستمان.

11. دواتر Suppository ەكە دەردێنینو سەری Suppository ەكە بە lidocaine دەكەین.
12. تەحامیلەكە داخیلی Rectal بكە و لەگەڵیشیدا تەحامیلەكەشدا 2 inches هەتا 3 inches پەنجەی index ببە ژورەوە.
13. لە كۆتایدا نەخۆشەكە داپۆشەو ریكۆردی بكە لەسەر Medication Record ەكە.



Note\ in cases of diarrhea don't insert Suppository through rectal

كاتێ نەخۆشەكە سكچونی هەبێت نابێت تەحامیلی لۆداینێیت یان داخیلی Rectal ی بكەی.

❖ ئەگەر ویستت تەحامیل بۆ منداڵ دابنێی، ئەوا یەكەمجار لەسەر ڕانی خۆتی دادەنێی دەبێت منداڵەكەشش بخەیتە سەر سك ئینجا تەحامیلەكە دابنێی.

# 3- *Inunction*

## بەکارهێنانی کرێم یان مەرحەم لەسەر پێست

شێوەی ئەو دەرمانانەی کە لەسەر پێست بەکاردەهێنرێت:

1) Jel
2) Cream
3) Ointment
4) Lotion

## چۆنیەتی بەکارهێنانی کرێم یان مەرحەم لەسەر پێست.

1. پێستەکە بشۆ یان خاوێنیکەوە پێش ئەوەی کرێم یان مەحەمەکەی لێبدەی
2. کە کرێمەکە یان مەرحەمەکەت لەدەست دا شوێنەکە مەساج بکە  و چینێکی تەنک دروست بکە.
3. کاتێک بۆ جاری دووەم کرێمەکە یان مەرحەمەکە لێدەدەی پێویستە ئەو شوێنەی کە مەرحەمەکە یان کرێمەکەت لێداوە بیشۆی، ئینجا لێیبدەیەوە.







*STEP1*

Cleanse your face with clean water for follow-up skin care

*STEP2*

Take out the right amount of noble cream and distribute it all over the face

*STEP3*

Pat the face gently with both hands, apply evenly and slowly absorb

بەلێدانی چینێکی زۆر ئەم حاڵەتە ڕوودەدات:

- ژەهراویبوون
- کەم هەڵمژین
- کەمی هەواگۆڕکێ

# 4- *Instillation*

Instillation بۆ چ شوێنێک دەکرێت؟

1) Eye

2) Ear

## Ear Drop

1. ئەگەر ویستت قەترەکەت بکەیتە گوێی ڕاست ئەوە نەخۆشەکە دەخەینە سەر لای چەپ بۆ ئەوەی قەترەکە بچێتە ناو گوێ.
2. پاشان سەیری گوێی نەخۆشەکە دەکەین بزانین هیچ پیسیەکی پێوەیە یان نا . ئەگەر پێیوەبوو ئەوا خاوێنی دەکەینەوە.
3. ئەگەر نەخۆشەکە کەسێکی پێگەیشتوو بوو ئەوا گوێیەکەی ڕادەکێشینە دواوە و بۆ سەرەوە، بەڵام ئەگەر منداڵ بوو گوێی ڕادەکێشینە بە ئاڕاستەی دواوە پاشان بۆ خوارەوە.



How to Instill Ear Drops in Adults



How to Instill Ear Drops in Children

4. Dropەکە دەکەینە سەر (Exit canal) واتا لاکانی گوێ، دواتر بۆ دوو سێ جار پەستان دەخەینە سەر tragus






تێکردنی قەترە یان مەرحەم بۆ چاو.

1. سەرەتا چاوی نەخۆشەکە پاک دەکەینەوە ئەگەر هەر پیسیەکی تێدابوو.
2. ئەگەر مەرحەمبوو ئەوە پێڵووی چاوی ڕادەکێشین و مەرحەمەکە لە ژورەوە بۆ دەرەوە تێدەکەین. بەڵام ئەگەر قەترە بوو ئەوە تەنها لەناووەوە دەکەین.







How to instill eye drops



Ointment

3. دوای ئەوەی کە قەترەکە یان مەرحەمەکەن تێکرد، داوا لە نەخۆشەکە بکە چاوی قەپات بکات و کەمێک پەستانی بخاتە سەر وە نەشیخورێنێت.

## تێبینی /

- ئەگەر دوو قەترەمان هەبوو، ئەوا پێویستە 5 دەقە بەینیان هەبێت.
- ئەگەر قەترەیەک و مەرحەمێکمان هەبوو، ئەوا یەکەمجار قەترەکە دەدەین بە نەخۆشەکە پاشان مەرحەمەکەی دەدەینێ.
- ئەگەر نەخۆشەکە لە دانیشتنەوە بوو. پێش ئەوەی مەرحەمەکە یان قەترەکەی بدەیێ، سەری بەرزکەوە بۆ دواوە.

# 5- *Irrigation*

Irrigation واتا شوشتن

شوشتن بۆ ئەم شوێنانە دەکرێت:

1. Ear
2. Eye
3. Nasal Canal
4. Stomach
5. Rectal

ئەو ئاوەی بۆ شوشتنی بەکاردێ:

1) Normal saline
2) Distal water زیاتر بەکاردێت.

{Toomey Syringe or Irrigation Syringe} بەکاردێت بۆ شوشتنی (گوێ - لوت - چاو)

له دوو حاڵەتدا لوت دەشۆین:

1) عەمەلیات
2) جیوب

لێرەدا تەنها یەک نمونە باسدەکەم

## Rectal Irrigation



1. مەبەست له بەکارهێنانی:
2. بۆ ئەوانەی نەشتەرگەری ناوبینین endoscopy دەکەن.
3. ئەوانەی تیشکی ناوسک دەگرن X-ray for bowel
4. ئەوانەی نەشتەرگەری کرانەوەی سکیان بۆ دەکرێت.
5. بۆ چارەسەرکردنی قەبزی توند.

کاتێک نەخۆشێک توشی قەبزی دەبێت ئەوکات enema بەکاردەهێنین بۆ چارەسەری قەبزیەکە.

| هەنگاوەکان | کەلوپەلەکان |
|---|---|
| • ڕوونکردنەوەی کردارەکان بۆ نەخۆش<br>• شۆردنی دەست و پارێزگاری کردن لە کەسایەتی نەخۆش<br>• دانانی پارچە قوماشێک لەژێر نخۆشەکە و پاڵکەوتنی لەسەر لای چەپ<br>• دانانی جێڵەکە لەسەر کاثیتەرەکە و تێکردنی بەشێوەیەکی هێواش<br>• تێکردنی دەرمانەکە و داخستنی بۆ ماوەی 5 خولەک<br>• پاشان کردنەوەی و هێنانە دەرەوەی کاثیتەرەکە<br>• شۆردنی دەستەکان<br>• تۆمارکردنی لە فایلی نەخۆش | • کاثیتەری کۆم<br>• جێلی نەرمکەرەوە<br>• Normal saline<br>• دەرمانی دیاریکراو<br>• Kidney dish<br>• کلێنکس<br>• Toomey Syringe |

# 6- *Skin application*

A transdermal patch is a patch that attaches to your skin and contains medication. The drug from the patch is absorbed into your body over a period of time.

مەجرەمە بۆ چ مەبەستێک بەکاردەهێنرێت؟

Transdermal patches are used to deliver a range of drugs into the body. Some of the drugs more often used in patches include:

- fentanyl to relieve pain
- nicotine to help with quitting smoking
- clonidine to treat high blood pressure

ئەو شوێنانەی کە مەجرەمەی لێدادەنێ:








تێبینی/

- نابێت patch لەو شوێنانە بدەی کە سوتاوە یانیش بریندارە.
- مەجرەمە ئاسانە بۆ بەکارهێنان، بەڵام بۆ ئەوەی بەباشی کار بکات گرینگە بەشێوەیەکی گونجاو بەکاریان بهێنین.

# Parenteral Route

| Parenteral route | Injecting drug into |
|---|---|
| Subcutaneous injection | Subcutaneous tissue |
| Intramuscular injection | Muscle tissue |
| Intradermal injection | Corium (under epidermis) |
| Intravenous injection | Vein |
| Intra-arterial injection | Artery |
| Intracardial injection | Heart tissue |
| Intraperitoneal injection | Peritoneal cavity |
| Intraspinal injection | Spinal canal |
| Intraosseous injection | Bone |

دەرزی لێدان کەبەعەرەبی پێی دەوترێ (حقنة) وە بە ئینگلیزی (injection) بریتیە لە تێکردنی مادەیەک شل بۆ ناو جەستە لەڕێگەی سرنجەوە ، وە جۆرەکانی دەرزی لێدان زۆرن بەڵام چوار جۆری سەرەکی هەیە کە پزیشک و پەرستارەکان لە کاتی چارەسەرکردندا و لە نەخۆشخانەو دەرمانخانەکاندا بەکاری دەهێنن،وەتێبینی پەرستار تەنها بۆی هەیە ئەم چوار جۆر دەرزیە بکات بۆ نەخۆش چونکی جۆرەکانی تری دەرزی لێدان ئەبێ پزیشکی پسپۆر ئەنجامی بدات یاخود پەرستارێکی ڕاهێنراو کە زۆر باش بزانێت بیانکات, کە ئەمانە چوار جۆرە سەرەکیەکەیەکەن :

1. *Intradermal Injection*
2. *Subcutaneous injection*
3. *Intramuscular injection*
4. *Intravenous injection*



# سوود و زیانەکانی دەرزی لێدان

## سوودەکانی:

1. بۆ نەخۆشێک کە بێهۆشبێت
2. کەسێک گەدەی تەواو نەبێت
3. نەخۆشێک هێڵنج و ڕشانەوەی هەبێت
4. نەخۆشێک کە توانای قوتدانی دەرمانی نەبێت لە ڕێگای دەمەوە بەهەر هۆیەک بێت

## زیانەکانی دەرزی لێدان ، کە لەوانەیە ڕووبدەن:

1. دەبێت کردارێکی معقم بێت ، چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی التهاب
2. لە دەرزی ماسولکەدا IM ئەگەر بەر دەمار بکەوێت لەوانەیە توشی شەلەلی بکات ، یان بچێتە لوولەی خوێنەوە ،زیانی هەیە
3. لە ڕێگای خوێنهێنەرەوە IV لەوانەیە هەندێک جار ئەم حاڵەتانەی خوارەوە ڕوووبدات:
   - هەوا دزە بکاتە ناو ڤێن .
   - ئەگەر دەرمانێکی بەهێز بێت لەوانەیە دیواری ڤێنەکە ئازار بدات .
   - وە ئەگەر بە خێرایی دەرمانەکەی بدەینێ ، ئەمەش زیان دروست دەکات بەتایبەت بەپێی جۆری دەرمانەکە ، بۆیە وا پێویستە بەشێوەیەکی هێواش دەرمانەکەی بدەینێ .

ڕەنگە پرسێك بکەن کە بۆچی هەندێك جار لێدانی دەرزی ئێشی هەیە ؟؟ چونکە دەرزی زۆر تیژە تەنها کە بەپێست دەچێتە خوار ئێشی دەبێت، ئەویش چونکە پێست هەستەوەرەکانی تێدایە لێرە هەندێك تەکنیك هەیە فێرنەکراون یان گرنگی پێنادەن.

1. دەبێ پێست و ماسولکەکان شل بن بۆ ئەمەش دەبێ نەخۆشە پاڵکەوێ نابێ بەهیچ شێوەیەك بەپێوە لێبدرێ، چونکە هەمووی گرژن وە نەخۆشەکەش خۆیڕەق نەکا، چونکە پێستەکەش توند دەبێ .
2. کە دەرزییەکە دەگریە دەست دەبێ زۆر بەخێرایی لە پێستەکە بڕۆیە ژوور نابێ لەرزە لەرزوو خاوەخاو بکرێت، چونکە چەند خێرابێ ئازاری کەمتربێ .
3. پێش ئەوەی بڕۆیە ناوپێست بە دوو پەنجە پێستەکە لێك بکەیەوە تا کەمترین پێست بەر دەرزیەکەت بکەوێ واتە نەنوشتێتەوە بەسەر یەکدا لەبری یەك سەنتیمەتر ببێتە دوو سەنتیمەتر پێست .
4. کە دەرمان دەکێشی لەناو ڤیاڵ دەرزیەکە کول دەبێت بۆیە نیدلێکی نوێ بەکاربهێنە ، هەمان شت بۆ لێدان بەکارمەهێنە.





# 1- *Intradermal Injection* *{ID}*

ئەم جۆرە دەرزیە تەنها بۆ فەحسکردنە ، بۆئەوەی بزانین ئەوکەسە حەساسیەتی بەو دەرمانە هەیە یان نا

لەم جۆرەدا نابێت شوێنی دەرزیەکە پاکبکرێتەوە وە بە گۆشەی 0 بۆ 15 پلە لێدەدرێت ، بڕێکی کەم دەکرێتە ژێرپێستەوە و دوای نیو کاتژمێر دواتر ئەگەر سووربوونەوە یان خورانی نەبوو ئەوە حەساسیەتی بەو دەرمانە نیە ، وە ئەگەر بە پێچەوانەوە ئەگەر سووربوونەوە یان خورانی هەبێت ئەوا حەساسیەتی پێی هەیە و نابێت ئەو دەرزیەی لێبدرێت .




## Sites of Injection:

- Inner Outer Arm
- Upper Chest
- Back beneath Scapula



## Size of Needle:

27 G




## Angle of Injection:

0°- 15°




## Syringe:

Insulin Syringe

## Amount:

**0.5mL {CC} Or 50 IU {Insulin Syringe}**

.

## Intradermal Injection Uses For:

- Sensitivity Test پشکنینی هەستیاری
  1. Allergy Test
  2. Tuberculosis Test {TB Test} پشکنینی نەخۆشی سیل
- Local Anesthesia بۆ سڕکردن

## Equipment:

1. Prescribed Medication ئەو دەرمانی کەبۆی نوسراوە
2. Sterile Syringe & Needle {27 G}
3. Marker
4. Cotton
5. Sharp Box
6. Disposable Gloves
7. PPE, If We Need
8. Small Gauze
9. Medication Administration Recorder {MAR}



## *Procedure:* پرۆسەکان

1) دەست شوشتن وە بردنی کەرەستەکان [illegible]نەخۆشەکە.
2) لەدەستکردنی *Gloves* وە لەبەرکردنی *PPE* ئەگەر پێویست بوو.
3) کردارەکە یاخود پرۆسەکە بۆ نەخۆشەکە ڕونبکەوە کە چیدەکەی
4) سەیری دەرمانەکە بکە بزانە بەسەرچووە یان نا ، وە بە چ ڕێگایەک دەیدی بە نەخۆش .
5) شوێنی دەرزی لێدانەکە دیاریبکە و پاشان شوێنەکە تەعقیمبکە. بەڵام ئاگاداربە ، ئەو شوێنەی دەرزیەکەی لێدەدەی نابێ لە نزیک *vein* بێت.
6) سەری نیدڵەکە لابدە و پاشان دەرزیەکە لێبدە بەگۆشەی {0°-15°} ، پاشان دەرمانەکی تێبکە.
7) پاشان لەهەمان گۆشەوە دەرزیەکە دەربێنەوە.
8) بە پارچە لۆکەیەک شوێنەکە بسرەوە بەڵام بەهیچ شێوەیەک نەکەی پەستان بخەیەسەر شوێنەکە یان مەساجیبکەی .
9) بە قەڵەمێک چوارگۆشەیەک دروست بکە لە شوێنی دەرزی لێدانەکە.
10) کات و بەرواری دەرزیلێدانەکە تۆماربکە.
11) دواتر کەلوپەلەکان بگەڕێنەوە شوێنی خۆی.

## 2- *Subcutaneous injection {SC}*

ئەم شێوازەی لێدانی دەرزی بەکاردەهێنرێت بۆ پێدانی دەرمان بەلێدانی لەژێر پێست , لەم جۆرەی دەرزی لێداندا دەرزییەکی کورت بەکاردەهێنرێت بۆ پێدانی دەرمانەکە لە چینی شانەی نێوان پێست و ماسولکە، مژینی دەرمانەکە بەم ڕێگایە بەشێوەیەکی هێواشترە بەراورد بە ڕێگای IV { لێدانی دەرزی لە خوێنهێنەر vein} , هەندێک کات لەماوەی تێپەڕبونی 24 کاتژمێر.

ئەم شێوازەی دەرزی لێدان بەکاردەهێنرێت کاتێک ڕێگاکانی دیکە کەمتر کاریگەر بن ، بۆ نموونە هەندێک جۆری دەرمان ناتوانرێت بەرێگەی دەم وەربگیرێت چونکە ئەنزیمەکان و ترشی گەدە دەبنە هۆی تێکشکاندن و لەناوبردنی.

ڕێگای ژێرپێست ڕێگایەکی ئاسان و سەلامەتە.

ئەو دەرمانانەی کە بە ڕێگەی subcutaneous دەدرێت بە نەخۆش ئەو دەرمانانەن کە بە قەبارەیەک و ڕێژەیەکی کەمن بەزۆری لە 1ml بۆ 2ml

ئەم دەرزیە بەگۆشەی 90 دەدرێت لە جێگاکە واباشترە بە دوو پەنجە مەودای 2 ئینج لەو جێگەیە بەدەست بگریت ، بەڵام ئەگەر چینی چەوری ئەو جێگەیە کەم بوو دەتوانیت گۆشەی 45 بەکاربهێنیت.

تێبینی/ ئەگەر کەسێک بۆ چەند جارێکی بەردەوام و دووبارە بووەوە پێویستی بەم ڕێگایەی دەرزی لێدان بوو ئەوا شوێنی لێدانی دەرزیەکە بگۆڕە ، چونکە دووبارەکردنەوەی لەهەمان شوێن دەبێتە هۆی تێکشکان و زیان بەرکەوتن بەو جێگەیە.



## Sites of Injection:

1) Outer Upper Arm
2) Abdominal
3) Outer Thigh
4) Back Scapula
5) Upper Ventrogluteal & Dorsogluteal

تێبینی / سایتی 1 و 2 زۆر زۆر باوە و پێویستە بیزانی . وە سایتی 3 یەمش بزانی باشە بۆ دەرزی SC . ئەوانی دیکە ئەگەر نەشزانی ئاساییە .






## Size of Needle:

25 G – 27 G

شەخس هەیە زەحیفە دەرزی G 27 ی لۆ بەکاردێ، وە شەخس هەیە قەڵەوە دەرزی G 25 ی لۆ بەکاردێ . واتا بەپێی قەڵەوی و زەحیفی کەسەکە سایزی نیدڵەکەش ئەگۆڕێ .



## Angle of Injection:

45° - 90°

تێبینی / گۆشەی دەرزی لێدانەکە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێ ، بۆیە پێش ئەوەی دەرزیەکە لێبدەی سەیری نەخۆشەکە بکە ئایە قەڵەوە یان زەحیفە ، منداڵە یان گەورەیە .




## Amount:

0.5 ml – 1ml {ml = CC}

## Syringe:

1CC – 2CC – 3CC

تێبینی / دەرزی ئەنسۆلین بەکارمەهێنە بەڵکو سرنجی 1 هەتا 3 سی سی بەکاربێنە. وە دەرزی ئامادەکراویش هەیە تایبەت بە SC.



# Subcutaneous Injection Uses For:

- Vaccine
- Anticoagulant دژە خوێنمەین {یەکێکە لە گرووپەکانی دەرمان}
  1. Heparin دەرمانی دژە خوێنمەین
- Insulin یەکێکە لەو دەرمانانەی کە شەکرەی دەینیتە خوارێ

**تێبینیەکی گرینگ /** پێش ئەوەی دەرمانەکەی تێبکەی دەرزیەکە ڕابکێشە بزانە خوێن دێت یان نا ، ئەگەر خوێن نەهاتە ناو سرنجەکە ئەوە دەرزی لێدانەکەت تەواوە ، بەڵام ئەگەر خوێن هاتە ناو سرنجەکە ئەوە دەرزی لێدانەکەت تەواو نیە وە پێویستە دەرمانەکەی تێنەکەی چونکە دەرمانەکە دەچێتە ناو خوێنەوە .

## Equipment:

1. Prescribed Medication ئەو دەرمانی کەبۆی نوسراوە
2. Sterile Syringe & Needle {25G - 27 G}
3. Marker
4. Alcohol
5. Cotton
6. Sharp Box
7. Disposable Gloves
8. PPE, If We Need
9. Small Gauze
10. Medication Administration Recorder {MAR}



## *Procedure:* پرۆسەکان

1) دەست شوشتن وە بردنی کەرستەکان ????? نەخۆشەکە .
2) لەدەستکردنی *Gloves* وە لەبەرکردنی *PPE* ئەگەر پێویست بوو.
3) کردارەکە یاخود پرۆسەکە بۆ نەخۆشەکە ڕونبکەوە کە چیدەکەی.
4) شوێنی دەرزی لێدانەکە دیاریبکە و پاشان شوێنەکە تەعقیمبکە .
5) شوێنی دەرزی لێدانەکە *Pinch* بکە و پاشان دەرزیەکە بە گۆشەی {45° - 90°} لێبدە بەپێی کێشی نەخۆشەکە {قەڵەوە یان زەحیفە} و تەمەنی نەخۆشەکە {منداڵە یان گەورەیە}.
6) پاشان لەهەمان گۆشەوە دەرزیەکە دەربێنەوە.
7) پاشان بە پارچە لۆکەیەک پەستان بخە سەر شوێنەکە.
8) کات و بەرواری دەرزی لێدانەکە تۆماربکە.
9) دواتر کەلوپەلەکان بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆی.

# 3- Intramuscular injection {IM}

دەرزی ماسوکە :

بریتییە لە داخڵ کردنی دەرمان لە ڕێگای بردنە ناوەوەی سەری نیدڵەکە بۆناو ماسولکە.

لە ماسولکەدا مژینی دەرمان خێراترە بەبەراورد بە ژێرپێست ، ئەمەش لەبەر ئەوەی لە ماسولکە مولولەی خوێن زیاترە کە وادەکات دەرمانەکە زووتر بمژرێ .

هەروەها ماسولکەکان ڕووبەری لەخۆگرتنی دەرمانی زیاترە بەبەراورد بە سێیەم چینی پێست کە ناسراوە بە {Subcutaneous tissue}.

## Sites of Injection:

Ventrogluteal

Dorsogluteal

Vastus Lateralis

Rectus Femoris

Deltoid



## سایتەکان بۆ دەرزی ماسولکە:

1. Deltoid muscle of the arm لە قۆڵ

ئەم سایتە زیاتر بەکاردێ بۆ ڤاکسین وە زۆر باو نییە بۆ بەکارهێنان بۆ بەڕێکردنی دەرمانی تر کە بۆ نەخۆشی کە بەکاردێن، چونکە ئەو ماسولکەیە قەبارەکەی بچوکەو توانای وەرگرتنی قەبارەی دیاریکراوی دەرمانی هەیە کە نابێ زیاتر بێ لە 1ml – 2ml

چۆن ئەم سایتە دیاری بکەین؟

یەکەم شت هەست بە ئێسکی Acromion process بکەیت کە دەکەوێتە لوتکەی قۆڵ دواتر دوو پەنجە لە خوار ئێسکی Acromion process دیاری دەکەی ، لە خوار ئەو دوو پەنجەیەیەوە سێ گۆشەیەک دەکەی هەر بە چاو سێ گۆشەکە بهێنە پێش چاوی خۆت گەر یەکەم جاریشتە بیکەی دەتوانی بە قەڵەمێک سێگۆشەیەک بکەی وەک وێنەکە،

لە سنوری ئەو سێگۆشەیەدا دەتوانی ڤاکسینەکە یان دەرزیەکە بکەی.



2. Vastus lateralis & Rectus Femoris muscle of the thigh          لەڕان

ئەم سایتە بەرگەی بڕێکی زیاتر لە دەرمان دەگرێ بەبەراورد بە Deltoid Muscle .

وە باشتری سایتە بۆ منداڵ بۆ دەرزی IM چونکە قەبارەی ماسولکەی ڕان گەورەترە لەچاو Deltoid .Muscle



3. Ventrogluteal muscle of the hip

ئەو سایتە پارێزراوترین سایتە بۆ پێگەیشتوان و منداڵی گەورەتر لە 7 مانگی ، چونکە ئەم سایتە قوڵە و نزیکیش نییە لە هیچ دەمار و هیچ خوێنبەر و خوێنهێنەرێکی سەرەکی ئەمەش وادەکات مەترسی کەمتر بێت.

چۆن ئەو سایتە دیاری دەکەی؟

ناو لەپی دەستت دادەنێی لەسەر hip bone و پەنجەکان ئاڕاستەیان بەرەوە سەرەوە دەبێت پەنجەی ناوەڕاست لەسەر لوتکەی hip bone دەبێت و پەنجە گەورەت ئاڕاستەی بەرەو groin بێت و لە ژێر پەنجە بچوکەکەشت هەست بە ئێسکی حەوز بکەی ، هەروەها پەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوەڕاست لێک جیادەکەیەوەو و شێوەی V پێ دروست دەکەی وەک لە وێنەکە دیارە، ئەو ڕووبەرەی کە لە ژێر شێوە V یەکە دروست بووە، سنوری دیاریکراوە بۆ لێدانی دەرزی ماسولکە.

پێویست لەسەر لا پاڵ بکەوێت .




Figure 4



Figure 5

4. Dorsogluteal muscles of the buttocks

بۆ ئەم سایتە سمت دەکەی بە 4 بەشەوە بەشی سەرەوە و دەرەوەی سمتەکە هەڵ دەبژێری وەک لە وێنەکەدا دیارە ئەم سایتە زۆر باوە بۆ بەکارهێنان لەلایەن چاودێرە تەندروستیەکان هەروەها ئەم سایتە مەترسی بریندارپوونی سایتیک نێرڤ هەیە کە دەمارێکی سەرەکیە و زۆر هەستیارە. پێویستە کەسەکە لەسەر دەم پاڵ کەوتبێ، وە بۆ ئەم سایتە تا 5CC ئاسایە دەرمان بەرێ بکرێت .

تێبینیەکی گرینگ / ئەگەر زانیت شوێنەکە دەرزی لێدراوە یان بریندار بووە ئەوە لەوێ مەدە و وئەگەر زیاتر لە جارێک دەرزیت کرد بۆ نەخۆش دڵنیابەوە کە شوێنەکەی دەگۆڕی بۆ دوورکەوتنەوە لە بریندار کردن و نارەحەتی ماسولکەکان.

زۆر ئاگاداربە / ئاگاداری ئەو دەمارەسەرەکیەبە {Sciatic Nerve} وەک لە وێنەکاندا ڕادیارە . ئەگەر دەرزیەکە بەر ئەو دەمارە بکەوێ لەوانەیە کەسەکە توشی شەلەلی بێ یاخود ببێتە هۆی کورت بوونەوەی ئەو لاقەی کە دەرزیەکەی لێدراوە .



- چۆنیەتی دەرزی لێدان لە سمت .

باشترین شێوە بۆ دەرزی لێدان بەدەمدا ڕاکشانە پاشان  خاوێنکردنەوەی جێگاکە بە گۆشەی 45 {لە سەرەوە ڕووەو خوار}.

دەرزییەکە ببەرە ژورەوە بە گۆشەی 90 بەڵام با هەموو نیدڵەکە نەچێتە ژوورەوە  .

پێش تێکردنی دەرمانەکە سحب یِک بکە نەوەک دەمی دەرزییەکە لەناو دەمارێکدا کۆتایی هاتبێیت ، پاشان بە هێواشی دەرمانەکەی تێبکە تا بە باشی بڵاو ببێتەوە ئازاری کەمتربێت

لە کاتی بەکارهێنانی دوو دەرزیدا هەریەکەو بدە لە ڕانێک (سمتێک).

## سودەکانی  دەرزی لێدان بە پاڵکەوتنەوە:

1. ماسولکەکان تەواو خاو دەبنەوە.
2. ئازاری کەمتر دەبێت دەرزێکە.
3. کڵۆو گرێ دروست نابێت.
4. دەرزێکە بە باشێ بڵاو دەبێتەوە.
5. دەرزێکە بەباشی کاری خۆی دەکات.
6. ئەگەر نەخۆشەکە ببورێتەوە کێشە دروست نابێت چونکە پاڵکەوتووە.
7. نەخۆشەکە هەست بە قورسی سمتی ناکات چونکە بە باشی دەرزێکە بڵاو بۆتەوە.
8. دەرزی کردن بە پاڵکەتنەوە ئەگەرێکی زۆر کەمی هەیە کە دەرزێکە سوتفەی دەماری ( Sciatic nerve) بکات، کە ئەو دەمارەیە زۆربەی جار لە کاتی دەرزی کردن بە پێوە دەرزی سوتفەی دەکات.

## زیانەکانی دەرزی لێدان بە پێوە:

1. ماسولکەکان کرژ دەبێت.
2. ئازاری دەرزیەکە زیاتر دە بێت.
3. کڵۆو گرێ دروست دەکات.
4. دەرزێکە بە باشی بڵاو نابێتەوەو بە باشی کاری خۆی ناکات چونکە دەرزێکە لە یەک شوێندا تۆپەڵ دەبێت.
5. ئەگەر نەخۆشەکە بە پێ وە بێت و ببورێتە وە ئەوا ڕەنگە سەری بەر شوێنێک بکەوێت و توشی زیانی زیاتری بکات، یان ڕەنگە دەرزێکە لە سمتیا جێ بمێنێت.
6. نە خۆشەکە هەست بە قورسی و ئازاری شوێنی دەرزێکە دە کات لەدوای تەواو بونی دەرزێکە.
7. دەرزێکە سوتفەی دەمار دەکات ئەگەر ئاقڵانەو زیرەکانە دەرزێکە بۆ نە خۆشە کە نەکرێت.



## Size of Needle:

20G – 23G






## Angle of Injection:

45° - 90°

## Amount:

1ml – 1oml {ml = CC}

ڕێژەی ئەو دەرمانەی کە لە نەخۆشەکەی دەدەی لە 1CC هەتاوەکوو 10CC دەتوانی لێیبدەی ، بەڵام ڕێژەی ئەو دەرمانەی کە لە نەخۆشەکەی دەدەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازە . بۆ نموونە:

ئەگەر ڕێژەی دەرمانەکە 2CC بوو ئەوا لە Deltoid Muscle لێیبدە.

بەڵام ئەگەر ڕێژەی دەرمانەکە 5CC بوو ئەوا لە Deltoid Muscle دەرزیەکە لێمەدە بەڵکوو لە ماسولکەی ڕان لێیبدە , چونکە قەبارەی ئەو دەرمانە زۆرە و لە ماسولکەی قۆڵ شوێنی نابێتەوە.

ئەگەر وانەکەی ئەوە دەبێتە گرێ لەناو ماسولکەکەدا ، لەبەر ئەوەی ماسولکەکە توانای هەڵمژینی ئەو قەبارە زۆرەی نیە و لە ئەنجامدا پاش ماوەیەک دەبێت بە نەشتەرگەری ئەو گرێیە لاببردرێت .

## Syringe:

1CC – 3CC – 5CC – 10CC



# Intramuscular injection Uses For:

- Vaccine
- Antibiotic
- Large Volume
- And More…

# Equipment:

1. Prescribed Medication ئەو دەرمانی کەبۆی نوسراوە
2. Sterile Syringe & Needle {20G – 23G}
3. Alcohol
4. Cotton
5. Sharp Box
6. Disposable Gloves
7. PPE, If We Need
8. Small Gauze
9. Medication Administration Recorder {MAR}



تێبینیەکی گرینگ / هەڵەیەکی زۆر گەورەهەیە

زۆر جار پەرستارەبەڕێزەکان ئەیکەن لەکاتی لێدانی دەرزی دا کە لە سمت ئەدرێت

کاتێک ئەوبەڕێزانە دەرزیەکە لێئەدەن کە نوکی سرنجەکەدرئەکەنەوە ۆکەیەک بەشوێنی دەرزیەکەدا ئەهێنن و ئەڵێن تەواو . پەرستاری بەرێز نەخێر ئەوە تەواونیە چونکە کە نوکی دەرزیەکە ئەکرێت بەگۆشتەکەدا بێگومان کۆمەڵێک وردە مولولەی خوێن ئەبڕێت ئینجا کەسرنجەکە دەردێنیتەوە ئەگەر ئەو ۆکەیە بۆماوەی یەک تا دوو خولەک لەسەر شوێنی دەرزی لێ دانەکە دانەنێت و وەزەخت نەخەیتەسەر ئەو شوێنە

ئەوا پاش ماوەیەک ئەو شوێنە بەهۆی بڕینی ئەو مولولەخوێنانەوە شوێنەکەی شین و مۆر ئەبێتەوە ئازار دروست ئەکات یان هەندێ جار خوێن لێ ڕۆیشتنەکە لە تەبەقەو چینی ناوەوەی ماسولکەکەدا ئەبێت و ئینجا شوێنەکەی خر ئەبێت و ئەبێت بەتۆپەڵ و ڕەق ئەبێت و وەک بەردی لێ دێت و لەکاتی دانیشتن و لەکاتی ڕۆیشتن و وەرزش کردن دا توشی ئازاری زۆرت ئەکات

دوای ئەوە ئەبێت بەنەشتەرگەری چارەسەری ئەو حاڵەتە بکرێت

ڕێنماییەکە ئەوەیە لەکاتی دەرزی لێ دانا ئەبێت پەرستارەکە ۆکەی تەعقیم کراو بەکار بهێنێت و دوای ئەوەی دەرزێەکەی لێ دا ئەبێت بەلای کەمەوە یەک بۆ دوخولەک و ئەبێت زەختیش بخرێتەسەر شوێنی دەرزیەکە

هاوڵاتی بەرێز ئەگەر پەرستارەکەیش سەری قاڵ بوو بەهۆی زۆری ئیشەوە دەتوانیت خۆت ئەو ڕێنماییە پەیرەو بکەیت

## پرۆسەکان          *Procedure:*

1. ناسینەوەی نەخۆشەکە بە تەواوی  لە ڕێگای خوێندنەوەی ناوی سیانی نەخۆشەکە ئەگەر هاتوو پێشتر هیستری لێ وەرگیرابێت ئەگینا دەبێ دڵنیای بکەیەوە لە ڕاستی دیاریکردنی نەخۆشەکە
2. پاشان پرۆسیجەرەکە ڕوونەکەیەوە بۆ نەخۆشەکە و ئیزنی لێ وەردەگری  و دڵنیا کردنەوەی ئەوەی کە نەخۆشەکە حەساسیەتی بە چ دەرمانێک هەیە  ,پاشان  شۆردنی دەست و پاک کردنەوەی بە تەواوی .
3. پاشان  کەل و پەلەکان ئامادە دەکەی و تاقیان دەکەیەوە بزانی هیچ کێشەیەکیان نییە  ئەوەش پێویستی بە چەند شتێکە لەوانە:

1) ئەوەی لێرەدا زۆر گرینگە بریتیە لە دڵنیاکردنەوەی دەرمانەکە کە ئاخۆ ڕاستت هەڵ بژاردوە یان نا زۆر گرینگە ئاگادارین تۆ پێویستە 4 شتی دەرمانەکە دڵنیابکەیەوە:
- ناوەکەی
- دۆزەکەی
- تاریخەکەی  {بەسەرچووە یان نا}
- سەیرکردنی خودی دەرمانەکە بۆ دڵنیا بونەوەی ئاسای دەرمانەکە وە بۆ ئەوەی  بزانی هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە وەکو ڕەنگ گۆڕان......

ئەگەر هاتوو لە هەریەکێک لەمانە دڵنیا نەبووی دەبێت داوای هاوکاری لە هاوڕێ کارمەندە تەندروستیەکەت بکەی،

2) دیاریکردنی قەبارەو جۆری سرنج و نیدڵەکەی گونجاو و پاشان دەستکێش لە دەست کردن  {دەستکێشێکی  clean }

4. پاشان ئامادەکردنی دەرمانەکە و خستنی دەرمانەکە بۆ ناو سرنجەکە بە بێ بوونی هیچ هەوایەک و دووبارە دڵنیاکردنەوەی دۆزەکە لە ناو سرنجەکە. پاشان کەڤەری نیدڵەکە دەخەیەوە سەری.
5. پاشان دیاری کردنی گونجاوترین سایت بۆ لێدانی دەرزی ماسولکە وە هەڵبژاردنی گونجاوترین position کە گونجاو بێت لەگەڵ سایتی لێدانی دەرزیەکە, بۆنمونە:

کاتێک سایتی  Dorsogluteal muscles هەڵبژێری پێویستە کەسەکە لەسەر دەم پاڵ کەوتبێت دوای هەڵبژاردنی سایت وpositionەکە  سایتە بە ئەلکهول خوێن دەکەیەوە و پاشان داخڵ کردنی نیدڵەکە لە سایتەکە بە گۆشەی 90 وە پێویست ناکا هەموو نیدڵەکە بەرێ بکەی بەڵکو نیدڵەکە بکە بە سێ بەشەوە دوو بەشی بە رێ بکە  وە بۆ سایتی  Deltoid muscle of the arm نیدڵەکە کەمتربەرێ دەکەی لە 3/2.

6. پاشان سحب دەکەی ئەگەر خوێن هات ئەوە دەرمانەکە داخڵ ناکەی وە ئەگەر خوێن نەهات ئەوە دەرمانەکە داخڵ دەکەی.
7. پاشان لۆکەی بخرێتە سەر 3 تا 5 دەقە دەستی بخرێتە سەروکەسەکە نەجوڵێت بۆ ئەوەی شین نەبێتەوە وە بۆ ئەوەی یارمەتی دەربێت بۆ بڵاو بونەوەی دەرمانەکە ، وە ئاساییە خوێنێکی کەم ببینرێت لە پاش دەرهێنانەوەی نیدڵەکە.
8. پاشان تۆمار بکرێت لەسەر فایلی نەخۆشەکە کە ئەو دەرزیەی بۆ کراوە.

# *4- Intravenous injection {IV}*

دەرزی لێدان لە خوێنهێنەر: بریتییە لە خێرا ناردنی دەرمان بۆناو ڕێڕەوی خوێن ، بەجۆرێک زۆرترین بڕی دەرمان هەڵدەمژرێت .

## Cannulation

### کانولا چییە ؟

کانولا بریتیە لە تیوبێکی لاستیکی بچوک(کاسیتەر) کە لەو تیوبە لاستیکەدا دەرزیەکی باریکی تیژ هەیە پێستەکە دەبڕێت و دەچێتە ناو ڤێنەکە وە دوای بڕینی ڤێنەکە دەرزیەکە سەحب دەکرێت و تیوبە لاستیکییەک لە ناو ڤێنەکە دەمێنیتەوە.

### کێن ئەو کەسانەی کە کانولایان بۆ دادەنرێت؟

1. بۆ ئەوکەسانەی کە توشی سکچون یان ڕشانەوەی هەبێت لە ریگەی کانولاکەوە فلودی پێ دەدریت.
2. بۆ کەسێک خوێنی زۆری لێ ڕۆشت بیت بەهۆی کانولاوە خوێنی تێ دەکرێت.
3. بۆ دەرزی لێدان.
4. کەسانێک کە بێ هۆشن لە ریگەی ئەوکانولەوە جۆرەها موغەزەی هەیە بۆی دەکرێت.
5. لەکاتی نەشتەرگەری.

### ئەو شوێنەی کە کانولای لی دادەنریت دەبیت چۆن بیت؟

1. دەبیت ڤێنێکی ڕێک هەلبژێریت.
2. دەبێت ئەو شوێنەی کانولاکەی لێ دادەنەیت , نابێت لەسەر جومگە بیت.
3. ئەو ڤێنەی کە کانولاکەی لێ دادەنەیت , نابیت پێشتر کانولای لی دانرا بیت
4. دەبێت ڤێنەکە جوان دیار بیت یان بە دەست بتوانی هەستی پێبکەی.

# *Parts of Cannula* بەشەکانی کانولا



*Classification of Cannula, By: color and Gauge.*

| Gauge | Diameter |
|---|---|
| 26G | Cosmos |
| 24G | Sun |
| 22G | Sky |
| 20G | Flower |
| 18G | Grass |
| 16G | Soil |
| 14G | Lava |

The smaller the gauge number, the larger the cannula diameter!

پەیوەندی نێوان Gauge لەگەڵ سایز پەیوەندیەکی پێچەوانەیە . هەر کاتێک قەبارەی کانوولاکە {Size of Cannula} گەورەبوو ، گێچەکەی {Gauge} بچوکتر دەبێتەوە .

Size ↑ , Gauge ↓     Size ↓ , Gauge ↑

## بەکارهێنانەکانی کانولا

هەڵبژاردنی کانولەیەکی گونجاو گرینگە بۆ نەخۆش بۆ پێدانی دەرمان و شلەی پێویست .

## چۆن قەبارەی کانوولاکە دیاریبکەین ؟

و / جۆری کانوولاکە دەگۆڕێ بەپێی:

1. خوێنهێنەرەکە
2. دۆخەکە
3. نەخۆشەکە
4. ئەو شلەیەی کە دەتەوێ پێیبدەی .



## *There are three main types of vascular access device.*

1) Peripheral venous catheter
2) Midline venous catheter
3) Central venous catheter




Peripheral venous catheter




Midline venous catheter




Central venous catheter

## *Peripheral sites*



## *Don't Forget {Don'ts} Before Start Vein Puncture.*

1. Don't Apply in cases of Hematoma, Surgery, and Burns.
2. Don't Apply on Antecubital Area or Joints.
3. Don't Apply on Ventral Sites {Radial Vein}.
4. Don't Apply in Cases of Mastectomy and Axillary Surgery.
5. Don't Apply In Shunt and Fistula.
6. Don't Apply in Lower Extremity.

هیماتۆما چییە ؟

کۆبونەوەی خوێن لەژێر پێست

پێی دەگوترێ Hematoma

## *Equipment*






Sharp Box

And

Under Pad

## Procedure: پرۆسەکان

1. ئەو شوێنەی دەتەوێ کانولای لێدابنێی دیاریبکە.
2. دەستەکانت بشۆ.
3. Glovesلەدەست بکە.
4. خوێنهێنەرەکە (vein) دیاریبکە بە ؛
   - دەست لێدان.
   - سەیرکردن.
   - توێکاری {ئەگەر بە دەست لێدان و تەماشاکردن ڤێنەکەت نەدیتەوە ئەوە بە ئاناتۆمی دەبێ بیزانی واتا بزانی خوێنهێنەرەکە لە کوێیە}.
5. تۆرنیکا ببەستە 10cm لەسەرووی ئەو ڤێنەی کە کانولاکەی لێدادەنێی.
6. بۆ ئەوەی ڤێنەکە دیاربێت ئەمانە بکە ؛
   - قۆڵی بێنە خوارەوە و لە ئاستی دڵ با نزمتربێ.
   - دەستی بکاتە مشت و بکاتەوە.
   - لە ڤێنەکە بدە بەڵام زۆر توند نا.
   - شتێکی گەرمی لەسەر دابنێ.
7. شوێنەکە خاوێن کەوە بە:
   - کحول { Alcohol %70 }
   - ئایۆداین { Iodine %70 }
   - کلۆرهێکسداین {Chlorhexidine}
8. کانولاکە داخیل بکە بە گۆشەی { °10 - °15 }
9. ئەگەر خوێن هاتە ناو فلەش باکەکە ئەوە کانولاکەت تەواو داناوە.
10. وە لەو کاتەدا سەیری کۆتای کانولاکە دەکەین هەتا بزانین خوین هاتۆتە ناوی ، ئەگەر خوین هاتبوە ناوی ئەوا دڵنیا دەبین کە کانولاکە لەناو ڤێنەکەیە یان کەمێک دەرزی ناو تیوبە پلاستیکیەکە سەحب دەکەین ئەگەر خوین هاتە ناو کانولەکە ئەوا سەرکەوتوو بوە. پاشان دەبێت وردە وردە دەرزیەکە سەحب بکەین و تیوبە پلاستیکیەکە پاڵدەنەینە ناو ڤێنەکە ،
11. پاشان تۆرنیکاکە دەکەینەوە و کانولاکە جێگیر دەکەین بە پلاستەر.
12. پاشان {2CC Distilled water or Normal saline} داخلی کانولاکە دەکەین.
13. بەروارەکە تۆماربکە .

بۆچی {2CC Distilled water or Normal saline} داخیلی کانولاکە دەکەین ؟

1. بۆ ئەوەی بزانین کانولاکە لەناو ڤێنەکەیە یان نا.
2. بۆ ئەوەی ئەو خوێنەی لەناو کانولاکەیە پاکبێتەوە .

تێبینی / پێویستە کانولا هەر 72 بۆ 96 سەعات جارێک بگۆڕدرێت . بەڵام بۆ منداڵ پێویست ناکات کانولاکە بگۆڕی .

## *Complication of Cannula*

1) Infiltration
2) Phlebitis
3) Throbophlebitis




Infiltration



Phlebitis




Throbophlebitis

## دەرمان لە ڕێگای IV بە سێ شێواز دەدرێت




ئەو فۆڕمانەی کە لە IV دەردرێن بە نەخۆش:

1) Vial
2) Ampule
3) Solution

### هیچ دەرمانێکی {IV} بەبێ کانولە مەدە بە نەخۆش ، بۆچی ؟

چونکە ئەو دەرمانە کاریگەری لاوەکی هەیە ، بۆنموونە ئەگەر نەخۆشەکە توشی حەساسیەبێت ئەوا ڤێنەکان هەمووی بزر دەبن ئەوکات هیچت بۆناکرێت ، بەڵام ئەگەر کانولاکەی بۆ داندرابێت ئەوا دەتوانی بە خێرایی چارەسەری بکەی .

پێدانی دەرمان بە شێوەیەکی خێرا یاخود ڕاستەوخۆ زیاتر بۆ حاڵەتی کتوپڕ (Emergency) بەکاردێت. دەرمانەکە لە ماوەی (1-5 Minute) دەدەین بە نەخۆشەکە. بۆ ئەوەی دەرمانەکە ڕاستەوخۆ کاریگەری هەبێت .

## چۆن بە Bolus دەرمانەکە بدەینە نەخۆشەکە ؟

1) دەرمانەکە لە ڕێگای کانولاوە لە (Injection port) لەماوەی 1- 5 دەقە دەیدەین بە نەخۆشەکە .




2) لە ڕێگای IV Set لە Injection port .




هەندێک جار نەخۆشەکە IV Set ئێکی پێوەیە و بە مغەزیەکەوە ڕەبتە.

بۆ ئەوەی دەرمانەکەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بدەی بە نەخۆشەکە پێویستە لە Injection port بیدەی.

بۆ ئەمەش مغەزیەکە بگرەوە . واباشترە سەرەوەی Injection port ەکە بنووشتێنیتەوە (Pinch)چونکە لەوانەیە هەندێک جار شوێنی گرتنەوەی مغەزیەکە بەباشی کارنەکات و لەکاتی تێکردنی دەرمانەکە لە Injection port ەکە دەرمانەکە بچێتەوە ناو مغەزیەکە .

> ئەگەر نەخۆشەکە دەرمانێکی بۆنوسرابوو.
>
> - ئەگەر ڤایەلبوو بەڵام Distal water ی لەگەڵ نەبوو ئەوە بە 5CC هەتا 10CC تەخفیفی بکە .
> - ئەگەر ئەمپول بوو بەڵام ئەمپولەکە تۆز ( Powder ) بوو بە 2CC هەتا 3CC لەناو ئەمپولەکە تەخفیفی بکە دواتر بیکە بە 5CC.

دەتوانین دەرمانێکی IV بدەین لەڕێگای مغەزی.

دەرمانەکە دەکەینە ناو مغەزیەکە و لە ماوەی 24 کاتژمێر دەیدەین بە نەخۆشەکە .

وە مغەزی بۆ ئەوکەسانەش دادەنرێت کە توشی Dehydration بوون.

## Dehydration چییە؟

Dehydration : حاڵەتێکە کاتێک ڕوودەدات کە لەش زۆر ئاو و شلەمەنیەکانی تر لەدەست دەدات کە پێویستی پێیەتی بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئاسایی کار بکات .

ئاو بۆ هەموو خانەیەکی جەستە پێویستە.

لە 60%ی جەستە لەئاو پێکهاتووە . بۆیە کاتێک ئاوی پێویست لەجەستەدا نیە یاخوود کەمە ئەوا پێی دەڵێن Dehydration واتە وشکبوونەوە........

## لەوانەیە (Dehydration) وشکبوونەوە ڕوو بدات کاتێ:

1. نەخۆشی (ڕشانەوە-سکچوون).
2. زۆر وەرزشکردن.
3. یان کاتێکی زۆر لەبەرگەرما بەسەر ببەی و بەشی پێویست ئاو نەخۆیتەوە.
4. برینێکی سەخت یان سووتاوی هەبێت.
5. کەسەکە نەتوانێت بخوات و بخواتەوە.

## وشکبوونەوە کاریگەری دەبێت لەسەر:

1. هاوسەنگی کانزاگرنگەکان.
2. ئاستی ووزە .
3. شێوازی کارکردنی گەدەوریخۆڵەباریکە بۆ هەرسکردن.
4. وە زۆرێک لەئەندامەکانی تر وەکو دڵ و مێشک و گورچیلەکان.

نیشانەکانی وشکبوونەوەی توووند بریتییە لە:

گێژی

1. وشکبوونی چاو (نەمانی فرمێسک).
2. وشکبوونی لێو زمان.
3. وشکبوونی پێست و چرچ و لۆچ بوونی.
4. هەستکردن بەماندوویەتی.
5. هەناسەدانی خێرا.
6. کەمبوونەوەی میزکردن.

چارەسەر بۆ ئەم حاڵەتە ؟

بەشێوەیەکی گشتی و باو بەکارهێنانی IV fluids ە بۆ ڕێگری کردن یان چارەسەرکردنی وشکبوونەوە.

تێبینی/ ئەگەرکەسەکە شلەیەکی زۆر وەربگرێ بەخێرای ئەواتووشی سەرئێشەو بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و کێشەی هەناسەدان دەبێت.

## قەبارەی مغەزی:

1) 100 CC
2) 500 CC
3) 1000 CC
4) 3000 CC {ئەم جۆرە مغەزیە بۆ شوشتنەوەی میزڵدان بەکاردێت}






## Crystalloidسێ بەشە:

Isotonic: ئەم شلەیە خەستیەکەی یەکسانە بە خەستی پلازما. چوار جۆر مغەزی دەگرێتەوە:

1) Normal Saline
2) Glucose Water {D5W}
3) Glucose Saline
4) Ringer Lactate

Hypotonic: ئەم شلەیە خەستیەکەی کەمترە لە خەستی پلازما.

Hypertonic: ئەم شلەیە خەستیەکەی زیاترە لە خەستی پلازما.

# *Isotonic*

## 1) Normal Saline ( NaCl ) 0.9%

کورت کراوەکەی:    N/S  یان  0.9% NaCl

ئەم فلوودە 154mEq/L ی لە سودیوم پێکدێت ،وە 154mEq/L لە کلۆرید پێکدێت ، وە هیچ ڕێژەیەکی شەکری تێدا نییە.

حاڵەتەکانی بەکارهێنانی:

1) بۆ نەخۆشێک زەختی دابەزیبێت.
2) لەکاتی Hypovolemia قەبارەی خوێنی کەم بێت.
3) لەپێش نیو بەنج و لەناو نەشتەرگەری.
4) بۆ گرتنەوەی زۆربەی دەرمانەکان.
5) لە کاتی سکچوون و ڕشانەوە ( Vomiting And Diarrhea ).
6) لەکاتی تەداوی و پاککردنەوەی برین.
7) لەکاتی لەدەستدانی صودیۆمی لەش ، کاتێک ڕێژەی صودیۆمی لەش کەمتر بێت لە 135mEq/L ...هتد.

ئەو حاڵەتانەی کە نابێت Normal saline بەکاربهێنین:

1) نەخۆشێک زەختی بەرز بێت.
2) نەخۆشی گوورچیلەی هەبێت (Kidney Disease).
3) عجزی دڵی هەبێت (Heart Failure).
4) لەکاتێک ڕێژەی صودیۆمی لەش زیاتر بێت لە 145mEq/L ....هتد.



## 2) 5% dextrose in water ( Glucose Water 5% ) or ( D5W )

کورتکراوەکەی : D5W یان G/W

ئەم فلوودە لە شەکر و ئاو پێکدێت . بۆ زانیاری فلوودە بەهێزەکانی ئەم جۆرە بریتین لە ( 10% , %25 , %50 ) بەڵام ئەم جۆرە بەهێزانەی وا باشترە لە خوێنهێنەرێکی گەورە پێی بدەین..

حاڵەتی بەکارهێنانی:

1) کەسێک ڕێژەی شەکری دابەزیبێت.
2) ئاوێکی زۆری لەدەستدابێت بەبێ ئەوەی ماددە کانزاییەکان لەدەست بدات کە بە زۆری بەهۆی تاوە ڕوودەدات.
3) زۆری کارکردنی سایرۆیدەکان ( Hyperthyroidism ).
4) بەرزی ڕێژەی کالسیۆم لە خوێن ( Hypercalcemia ).
5) ئەگەر ئاستی پۆتاسیۆم زۆر بەرزبێت ( Hyperkalemia ).
6) ئەوکەسانەی زەختی بەرزیان هەیە ( Hypertension ).

ئەو حاڵەتەی کە نابێت بەکاری بهێنین:

1) کەسێک ڕێژەی شەکری بەرزبێت.
2) بە گشتی لە حاڵەتی بوژاندنەوەی دە بەکار ناهێت چونکە شەکرە بەرز دەکاتەوە.
3) بەکارناهێت بۆ ئەوکەسانەی مەترسی فشاری ناو سەریان لەسەرە چونکە دەبێتە هۆی هەڵئاوسانی مێشک.



## 3) Glucose Saline (Dextrose Saline) { Dextrose 5% in 0.9% NaCl }

ئەم فلوودەیان شەکروو خوێ لە پێکهاتەکەیدا هەیە.

حاڵەتی بەکارهێنانی:

1) بەکاردێت بۆ ئەو نەخۆشانەی کە پەستانی خوێن و شەکرەیان دابەزیوە.
2) بۆ حاڵەتی سکچون و ڕشانەوە و وشکبوونەوە بەکاردێت.

ئەو حاڵەتەی کە نابێت بەکاری بهێنین:

1) بەکار ناهێت بۆ ئەوکەسانەی کە پەستانی خوێن و شەکرەیان بەرزبۆتەوە.

بۆ زانیاری/ هەموو ئەو فلوودانەی کە شەکر لە پێکهاتەکەیاندا هەیە نابێت بۆ پاککردنەوەی برین بەکاربێت چوونکە دەبێتە هۆی گەشەی بەکتریا..



## 4) Ringer Lactate (Hartmann solution)

کورتکراوەکەی : R/L یان L/R

ئەم فلوودە زۆربەی ئەلیکترۆلیتەکانی تێدایە وەک (Potassium, Calcium, Potassium, Chloride )

وە 130mmol/L صۆدیۆمی تێدایە ، وە 109mmol/L کلۆریدی تێدایە.

### حاڵەتی بەکارهێنانی:

1) لەکاتی سکچوون ( Diarrhea ).
2) لەکاتی ڕشانەوە ( V0miting ).
3) لە ماوەی نەشتەرگەری
4) لە حاڵەتی وشکبوونەوە (Dehydration).
5) بۆ کەسێک پەستانی خوێنی دابەزیبێت.
6) بۆ ئەو کەسانەی شەکرەیان بەرزە و ماددەی کانزاییان لەدەستداوە.
7) شۆک.
8) خوێنبەربوون.

### ئەو حاڵەتەی کە نابێت بەکاری بهێنین:

1) بۆ کەسێک بەکارناهێت کە کێشەی جگەر و گورچیلەی هەبێت.
2) ئەو کەسانەی PH خوێنیان بەرزتربێت لە 7.5



## Medication via Intravenous Intermittent   پێدانی دەرمان بەشێوەی پچڕ پچڕ

بۆ ئەم شێوەی پێدانی دەرمانە دوو جۆر مغەزیمان هەیە:

1) 50 CC
2) 100 CC

دەرمانەکە دەکەینە ناو مغەزیەکە و لە ماوەی ( 4h - 6h - 12h ) دەیدەین بە نەخۆشەکە.

به دوو رێگا دەتوانین دەرمان بدەین به شێوەی پچڕ پچڕ{Intermittent}

Computerize Infusion Pump

- Infusion pump
- Syringe pump





دەبێت بە دەست دلۆپ دلۆپ بژمێرین ، هەتا بزانین لە یەک خولەک چەند دلۆپ ئەڕوات لە IV Set ەکە . واتا پێویستە Fluid calculation بزانین.

Infusion pump



## Procedure: پرۆسەکان

1) Infusion pump ەکە بە IV Stand ەکەوە دەبەستینەوە.
2) مغەزیەکە حازردەکەین و پاشان سەرێکی IV Set ەکە بە مغەزیەکە ڕەبتدەکەین.
3) پاشان IV Set ەکە بە ئامێرەکە ڕەبتدەکەین, هەوەکو لە وێنەکەدا دیارە.
4) ئامێرەکە دوگمەی (on - off) ی لەسەرە ، ئامێرەکە پێدەکەین.
5) ئامێرەکە بەشێکی هەیە پێی دەڵێن sensor ، بە Chamber ی IV Set ەکە ڕەبتی دەکەین بۆ ئەوەی دڵۆپەکان بژمێری.

بۆ نموونە:

ئەگەر پزیشکەکە بۆتی نوسیبێ فلوودێکی 500CC بە 4h بدەین بە نەخۆش ، ئەوا 125=500/4 . واتا دەبێ 125CC بدەین بە نەخۆشەکە لە ماوەی یەک سەعات.

پاشان لەسەر ئامێرەکە دیاری دەکەین . دواتر Start دادەگرن.

لە کۆتایدا هەوای ناو IV Set ەکە بەتاڵ دەکەینەوە و دواتر بە کانولاکەوە ڕەبتی دەکەین.



IV Stand



# Syringe pump

له Syringe pump ، چ جۆرە سرنجێک بەکاردێ؟

1) Syringe 10 CC
2) Syringe 20 CC
3) Syringe 50 CC

بەڵام زیاتر سرنجی 50 CC بەکاردێت.

## پرۆسەکان Procedure:

له Syringe pump پێویستمان به دوو شته ، ئەوانیش:

1) Syringe 50CC
2) Extension line

Extension line سۆندەیەکە بەکاردێت بۆ ئەوەی سرنجەکە به نەخۆشەکە ببەستینەوە.

ئەگەر نەخۆشەکە ئەمپولێکی 10CC بۆ نوسرابوو ، ئەوا 40CCمغەزیەکە سەحب دەکەینە ناو سرنجەکە و پاشان ئەمپولەکە سەحب دەکەینە ناو سرنجەکە.

Extension line دوو سەری هەیە ، سەرێکی بە سرنجەکەوە و سەرەکەی تری بە کانولای نەخۆشەکە ڕەبت دەکەین.

له کۆتایدا لەسەر Syringe pump دیاریدەکەین و پاشان Star دادەگرین .

## تێبینی/

1) Infusion pump و Syringe pump لەم شوێنانە بەکاردێت:

1. Oncology
2. Critical care
3. Medical ward
4. Operation room

2) Infusion pump و Syringe pump هەردوکیان دوگمەی ( Bolus )یان لەسەرە ، واتا دەتوانین بە خێرایش دەرمانەکەیان پێبدەین.



تێبینی/ ئەگەر ویستمان چەند دەرمانێک لە یەک کاتدا بدەین بە نەخۆش ئەوە

{ 3-Way or 3-Way Extension Line } بەکاردەهێنین.



3-Way



3-Way Extension Line

# Pulmonary Route

- Pulmonary Route
- Having patient inhale drug



Inhalers بەخاخات (هەڵمژەرەکان): ئامێرێکە بەکاردەهێنرێت بۆ گەیاندنی دەرمان بۆ ڕێرەوی هەناسەدان و سییەکان. بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ چارەسەرکردن و ڕێگری کردن لە نەخۆشیەکانی ڕێڕەوی هەناسەدان بەکاردەهێنرێت، وەک

{Asthma - COPD - Cystic fibrosis}

## بۆچی بەکارهێنانی بەخاخەکان بەشێوەیەکی دروست گرینگن؟

زۆر گرینگە بەخاخەکان بەشێوەیەکی دروست بەکاربهێنین چونکە بەکارهێنانی بەشێوەیەکی دروست وادەکات ڕێژەی تەواوی دەرمانەکە وەربگیرێت و بگاتە قەلاَی سییەکان. بۆیە زۆر گرینگە لەکاتی وەرگرتنی بەخاخ پرسیار لە دکتۆری پسپۆڕ یان دەرمانساز یاخود پەرستارەکە بکەیت بۆ ئەوەی تەکنیکی بەکارهێنانەکەت بۆ ڕون بکاتەوە .

## چۆن بڕیار دەدەین گونجاوترین بەخاخ هەڵبژێرین؟

بەخاخەکان دەرمانی زۆر گرینگن بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشە درێژخایەنەکانی کۆئەندامی هەناسە و نەخۆشیەکانی وەک Asthma and COPD

بەخاخەکان لە شێوەو قەبارەدا جیاوازن، بۆیە دەتوانرێت بەخاخێکی گونجاو بۆ نەخۆشەکە دیاری بکرێت بە گفتوگۆکردن لەگەڵ دکتۆری پسپۆڕ و ئەوکەسانەی کاردەکەن لەبواری هۆشیارکردنەوەی نەخۆشیەکانی کۆئەندامی هەناسە، لەبەر ئەوەی هەموو جۆرە دەرمانێک بەشێوەی بەخاخ بەردەست نین.

## جۆرە جیاوازەکانی بەخاخەکان چین ؟

زۆر جۆری جیاوازی بەخاخمان هەیە بەلاَم بەشێوەیەکی سەرەکی سێ جۆر بەخاخ بەکاردەهێنرێت.

1. Metered dose inhalers (MDIs)
2. Dry powder inhalers (DPIs)
3. Soft mist inhalers (SMIs)

## چۆنیەتی بەکارهێنانی بەخاخ




1) سەرەتا پێویستە سەر قەپاغی بەخاخەکە لاببەین.
2) پاشان بەخاخەکە 3 هەتا 5 جار بە شێوەیەکی رێک و پێک بشەقێنین. پاشان ئەگەر بۆ یەکەم جار بوو بەخاخەکە بەکاربهێنیت یاخود بۆ ماوەی هەفتەیەکە بەکارت نەهێناوە ئەوا پێویستە بەخاخەکە جارێک یان دوو جار لە هەوا دایبگریت دوور لە دەم و چاو بۆ ئەوەی ژەمی دەرمانەکە ئامادەبێت.
3) دواتر هەناسەیەکی قوڵ دەدەینەوە بۆ ئەوەی سیەکانمان خاڵی بێت لە هەوا (لەکاتی ئەنجامدانی ئەم کارە، پێویستە کەسەکە بەپێوە وەستابێت یاخود دانیشتبێت و سەری ڕاست و کەمێک بۆ دواوە بێت)
4) پاشان بەخاخەکە لەسەر دەم دایدەنێین و بە ددان و لێو دەیگرین بە شێوازێک هیچ بۆشاییەک نەبێ لەنێوان بەخاخەکە و لێومان و پێویستە بەخاخەکە بەڕاستی بگرین و لار نەبێت پاشان هەناسەیەکی قوڵ هەڵدەکێشین و لەگەڵیدا بەخاخەکە دادەگرین بۆ ئەوەی ژەمی دەرمانەکە بەتەواوی بچێتە ناو سیەکان.
5) لە کۆتاییدا بەخاخەکە لەسەر دەممان لادەبەین و هەناسەمان بۆ ماوەی 10 چرکە ڕادەگرین بۆ ئەوەی زۆرترین ڕێژەی دەرمانەکە بگاتە سیەکان پاشان بە هێواشی هەناسەکە فڕێ دەدەینە دەرەوە.

### تێبینی

1) ئەگەر پێویستت بە زیاتر لە ژەمێک دەرمان بوو ئەوا پێویستە بۆ ماوەی 1 خولەک چاوەڕێ بکەیت و پاشان پرۆسەکە دوبارە بکەیەوە بەڵام ئاگاداربە پێویستە بەخاخەکە بشەقێنی لەنێوان ژەمەکاندا.
2) دوای هەر بەکارهێنانێک پێویستە نێو دەممان بە ئاو بشۆین بۆ پاراستنی نێو دەممان لە توشبوون بە کەڕوی نێو دەم و دەنگ گربوون و دەنگ کەوتن و سوربونەوەی قورگ.
3) پێویستە بەخاخەکە دوور لە جەستە بەکاربهێنین بەتایبەت چاوەکان.
4) هەندێ جۆری بەخاخ هەیە پێویستیان بە شەقاندن نیە پێش بەکارهێنان.

# Nebulizer

A nebulizer is a small machine that turns liquid medicine into a mist, allowing for quicker and easier absorption of medication into the lungs.

Typically, nebulizers come in both electric or battery-run versions, and are either portable (so you can carry with you).

Nebulizer (پرژێن): ئامێرێکی بچوکە، کە دەرمانی شل دەکات بە تەم(هەڵم). کەواتە دەرمانەکە خێراتر و ئاسانتر هەڵبمژرێ بۆ ناو سیپەکان.

بە شێوەیەکی ئاسایی، Nebulizerەکان دوو جۆری کارپێکردنیان هەیە. بە کارەبا یان بە پاتری (کەواتە تۆ دەتوانی لەگەڵ خۆت هەڵیبگریت).

Both versions of nebulizers are made up of:

- a base that holds an air compressor
- a small container for liquid medication
- a tube that connects the air compressor to the medication container

هەردوو ڤێرژنی نیبولایزەرەکان پێکدێن لە:

- بنکەیەک کە هەوای پەستێنراوی هەڵگرتوە.
- دەفرێکی بچووک بۆ دەرمانی شل.
- هەروەها بۆریەک بۆ بەستنەوەی هەوا پەستێنراوەکە بە دەفری دەرمانەکەوە.

## A nebulizer is helpful for a variety of conditions, including:

نیبولایزەر بەسوودە بۆ چەند حاڵەتێک، لەوانە:

- chronic obstructive pulmonary disease (COPD)
- asthma
- bronchiectasis
- cystic fibrosis
- pulmonary fibrosis

سێ جۆری سەرەکی Nebulizer مان هەیە:

1. Jet nebulizers
2. Ultrasonic nebulizers
3. Mesh nebulizers

## 1. Jet nebulizers



لەم جۆرە ئامێرە هەوای قەتیسکراو بەکاردەهێنرێت بۆ پاڵپێوەنانی دەرمانە بەهەڵمکراوەکە بۆ ناو mask یان mouthpiece بۆ ئەوەی نەخۆشەکە بەکاری بهێنێت. ئەم جۆرە Nebulizer پێویستی بە وزەی کارەبا هەیە بۆ بەکارهێنان، بۆیە ئەم جۆرە زیاتر لە ماڵەوە بەکاردەهێنرێت. هەروەها باوترین جۆری نیبولایزەرە.

### چۆنیەتی بەکارهێنانی Jet Nebulizer


1


2


3


4


5


6


7


8

1. سەرەتا دەستمان جوان پاک دەکەینەوە بە ئاو و سابوون.
2. ڤایەڵەکە دێنین هەڵی دەپچڕین، پاشان ئەو گیراوەی ناوی دەکەینە نێو سەرەقەپاغی ئامێرەکە.
3. پاشان سەری ماسکەکە (Face mask or Mouthpiece) دادەنێینەوە سەر سەرەقەپاغی ئامێرەکە و ئامادەی دەکەین.
4. ماسکەکە دەلکێنین بە ئامێرەکە.
5. ئامێرەکە دادەگیرسێنین.
6. پاشان نەخۆشەکە لە شوێنێکی سەلامەت و ئارام دادەنێین و سەرەقەپاغی ئامێرەکە یاخود ماسکەکە لەسەر دەمی دادەنێین، پاشان داوا لە نەخۆشەکە دەکەین کە بە هێواشی هەناسە هەڵبمژێت تاکو ئەوکاتەی کە هیچ بڕە دەرمانێک لەناو سەرەقەپاغەکە نامێنێت. ئەمەش زۆربەی کات (5 تا 15) خولەک دەخایەنێت.
7. دوای تەواوبوون ئامێرەکە دەکوژێنینەوە.
8. پاش ئەنجامدانی پرۆسەکە سەرەقەپاغی ئامێرەکە پاک دەکەینەوە.

## 2. Ultrasonic nebulizers

ئەم جۆرەیان بەهۆی دەردانی شەپۆلی دەنگی کە بە شێوەی ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر شلەکە و دەیگۆڕێت بۆ تەنۆلکەی هەڵواسراو aerosol کاردەکات، کە تێیدا ئەم شەپۆلانە دەبنە هۆی دروستکردنی قەترەی بچوک بچوک لەنێو ئامێرەکەدا و بەمەش بە ئاسانی دەگوازرێتەوە لە ئامێرەکەوە بۆ ناو (mask or Mouthpiece)ەکە بەمەش ئەو تەنۆکە هەڵواسراوانەی کە دروستبوون لەو قەترە بچوکانە بەشێوەیەکی قوڵ دەگوازرێنەوە بۆ سییەکان.

تێبینی/ ئەمانە زیاتر بەکاردێن لە نەخۆشخانەکان وە بە شێوەیەکی ئاسایی بۆ بەکارهێنانی کەسی نین.

جۆرەکانی Ultrasonic Nebulizer







چۆنیەتی بەکارهێنانی Ultrasonic Nebulizer

HOW TO USE



1.Connect the power or put the battery in



2.Open the clip, fill the medicine container with liquid



3.Attach the accessories to the container



4.Start the device using the on/off button



5.Begin to nebulize



6.Turn off

1. سەرەتا ئامێرەکە دەبەستین بە سەرچاوەی وزە یاخود پاتری بەکاردەهێنین.
2. سەری ئامێرەکە دەکەینەوە و دەرمانەکەی تێدەکەین.
3. پاشان بەشەکانی تری ئامێرەکە ئامادە دەکەین و پێکیان دەبەستینەوە.
4. ئامێرەکە دادەگیرسێنین.
5. کرداری بەهەڵمبوون دەست پێدەکات.
6. دوای بەکارهێنان ئامێرەکە دەکوژێنینەوە.

## 3. Mesh nebulizers

لەم جۆرەیان لەرەلەر بەکاردەهێنرێت بۆ گواستنەوەی دەرمانەکان کە تێیدا هەزاران تەنۆلکەی هەڵواسراو دروست دەکات بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی زۆر ئاسان هەڵبمژرێت لە ڕێگای mask یان mouthpiece. بەکارهێنانی ئەم ئامێرە وادەکات دەرمانەکان بە باشترین شێوە بگەن بە قوڵایی سییەکان، بەمەش چارەسەرەکە بەشێوازێکی زۆر کاریگەر دەبێت

ئەم جۆرە Nebulizer ە کێشی زۆر کەمە و ئاسانە بۆ گواستنەوە و بەکارهێنان بەشێوەیەکی گونجاوە بۆ منداڵان و بەتەمەنەکان.

تێبینی/ بەپێی سایتی Healthline ئەم جۆرە نیبولایزەرانە نوێترن و زۆر جار کاریگەرترن لە Jet Nebulizer.

### چۆنیەتی بەکارهێنانی Mesh Nebulizer







تێبینی/ جۆری دووەم و سێیەم شێوازی بەکارهێنانیان زۆر لەیەکەوە نزیکە.

### چەند تێبینیەک

1. پێویستە Nebulizer پارێزراوبێت لە تیشکی خۆر و تیشکی لایت و شوێنی شێدار.
2. پێویستە لە پلەی گەرمی 2 بۆ 25 پلە هەڵبگیرێت.
3. پێویستە دوای هەر بەکارهێنانێک، Nebulizer ەکە پاکبکرێتەوە.
4. بەکارهێنانی Nebulizer نزیکەی 10 بۆ 15 خولەک دەخایەنێت، تەواوی ئەوکارەی کە دەبێت بیکەی ئەوەیە کە بە شێوەیەکی ئاسایی هەناسە بدەی.
5. هەموو دەرمانێک ناتوانرێت بە Nebulizer بدرێت. هەندێک دەرمانی وەک ستیرۆیدەکان پێویستە لەڕێگای بەخاخەوە (inhaler) بدرێن.
6. Examples of medications used in nebulizers include:
   - Bronchodilators are drugs that help to open up the airway.
   - Medical-grade saline (saltwater) solutions are solutions that help break up mucus in the lungs.
   - Antibiotics are used to help treat or prevent infections.

# How to Clean a Nebulizer




پێویستە Nebulizer ەکە دوای هەر بەکارهێنانێک پاکبکرێتەوە. ئەگەر ئامێرەکە بە دروستی پاک نەکرێتەوە، بەکتریا و میکرۆب دەتوانن لەناویدا گەشەبکەن.

پرسیار لە دکتۆرەکەت بکە بۆ ئەوەی ڕێنمایت بداتێ لەسەر چۆنیەتی پاککردنەوە و بایەخدان بە ئامێرەکە.

بە گشتی:

- پێویستە دوای هەر بەکارهێنانێک، بە ئاوی گەرم و سابوون پاک بکرێتەوە.
- دەبێ لەسەر خاولی یان لەسەر جلی خاوێن وشک بکرێتەوە.

Method 1 of 2:
## Quick-Cleaning Your Nebulizer

*Perform these steps after each use of your nebulizer.*



1. Wash your hands



2. Take the nebulizer apart, if possible.

Most nebulizers consist of a mask or mouthpiece, a section of tubing, a few connecting pieces, and a compressed air machine



3. Wash the cup or mouthpiece with warm water.

Run some warm (not hot) water.



4. Let air dry.

set it on a clean towel.



5. Put the machine back together and store.

When the pieces are dry, put the entire nebulizer back together

Method 2 of 2:

## Deep-Cleaning Your Nebulizer

*Perform these steps every three to seven days while using your nebulizer.*









# Reference

## Dr. Mustafa Hatam Saeed


❖ https://www.healthline.com/

❖ Fundamentals of Nursing: The Art and Science of Nursing Care {7th edition}

❖ Inhalers Pdf {Prepared By Pharmacist: Muhammad Auni Ali}

❖ YouTube

ئـەوەی کە فێری بــووی کارپێبکە
ئینجا هەوڵی فێربوونی شتێکی نوێ بدە
بــۆیە هەمیــشە لەبیرتبـــت
{ عیلمی بێ عەمەل داری بێ بەرە }

